# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمارە (١)، خولی دووەم، ئەیاری ١٩٧٩

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

موحەممەدی مەلاکەریم

بارەگای گۆڤار

بغداد • الوزيرية

مقابل كلية التربية الرياضية

مقر جمعية الثقافة الكردية

لە چاپخانەی (شەفیق) لە بەغدا لەچاپدراوە

# « الكاتـب الكـردي »

مجلة « نووسەری کورد »

مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العدد ( ١ ) ، الدورة الثانيـة . مايـــس ١٩٧٩

رئيـس التحريـر

الدكتــور عــزالدين مصــطفى رســول

سـكرتير التحريـر

محمــد المــلا عبــدالكريم

الادارة

بغــداد • الوزيريــة

مقابــل كلية التربية الرياضية

مقــر جمعية الثقافة الكردية

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

*No. ( 1 ) , Second Period, May 1979*

EDITOR - IN - CHIEF :
DR. IZZADDEEN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR - IN - CHIEF :
MUHAMMAD MULLA ABDULKAREEM

OFFICE : BAGHDAD , WAZEERIYYAH , OPPOSITE COLLEGE OF PHYSICAL EDUCATION , HEADQUARTERS OF THE KURDISH CULTURAL SOCIETY

# سەرلەنوێ «نووسەری کورد»

خوێنەواری خۆشەویستی کورد !

پاش پێنج ساڵ چاوەڕێ کردن ، وا ئێمەو ئێوەش سەرلەنـــوێ « نووسەری کورد » لە ڕێڕەوی کاروانی وشەی پاکی کوردیـــــدا دەبینینەوە •

ئەگەر دەرچوون و نەمان و سەرهەڵدانەوەی ڕۆژنامەو گۆڤـــاری کوردی ، لە هەموو مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بەسترابێت بـــە باری ئەو ڕۆژنامەنووسی یە خۆی و پێوەندیی تەواوی بە باری کــــوردو هەڵچوون و داچوونی مافی نەتەوەیی یەوە ، ئـــەوا دەرنەچـــوون و سەرهەڵدانەوەی « نووسەری کورد » بەســــترابوو بە باری یەکێتیی نووسەرانی کـــوردەوەو لە جەمســـەری پێوەندیی ئـەو یەکێتی یەشەوە بەسترایەوە بەو بارە گشتی یەوە •

وەك هەموو دەزانین لەو پێنج ساڵەی ڕابوردوودا یەکێتیـــــی نووسەرانی کورد لە جموجووڵ خرا • لەو چەند ساڵەدا بەپێی خواستی مەردانەی زوربەی ئەندامانی یەکێتی ، گەلێك هەوڵ و تەقـــەلا یــۆ خستنەوەکارو جموجووڵی یەکێتی درا ، تا کاربەدەســـتان هاتـــن بەدەنگمانەوەو سەرلەنوێ لە ١٠ ـ ١٤ی ئەیلوولی ١٩٧٨دا لە شـــاری هەولێر پێنجەم کونگرەی یەکێتی بەسترا •

ئەو کونگرەیە لە هەموو ڕوودواوو دیمەن و هـەڵبژاردنیدا ئەوەی سەلماند ، کە نووسەرانی کورد ، هوشیارانە یەکێتی یەکەیان دە پارێزن و لە ئەرکی یەکدەنگی و یەکگرتنی خۆیان دەگەن •

کۆنگرەی پێنجەم ئەوەی سەلماند ، کە یەکێتیی نووســــەران ، ئایستا دڵسۆزی چەند ساڵەی مێژووی خۆیەتیو لە ڕۆژی دامەزرانیــەوە تائێستا سەرڕاستە بۆ پەیمانو پێڕەوی ناوخۆی خۆیو ئــەو چوارچێــوە فراوانەیە کە هەموو نووسەرانی کورد کۆدەکاتەوە ، بە هەموو ڕێبــازو تەمەنو جیاوازی‌یەکیانەوە • ئەوەی سەلماند کە نووسەری کورد ، وەك نووسەری هەموو گەلو وڵاتی‌تر جیاوازی‌یان لەگەڵ یەکتردا هەیــە ، بەڵام ئامانجێکی گەورەو بەرزیش هەیە کە بەیەکیانـــەوە دەبەستێتو یەکێتی‌یەکەشیان چوارچیوەی یەکگرتنیانە لەدەوری ئەو ئامانجە گەورەو بەرزە ، کە لە هەموو بەڵگە نووسراوەکانی یەکێتیدا دیارە •

نووسەرانی کورد ، بە زوربەی دەنگو بەجۆرێکی دیموکراتی‌و ئازاد دەنگی خۆیان داو دەستەیەکی بەڕێوەبەری تــازەی ئەوتۆیـــان هەڵبژارد کە هەڵگری مەشخەڵی پڕ لە شانازیی یەکێتـــی بێــت ، دڵسۆز بێت بۆ هەموو لایەنە ڕووناکە بەتینەکانی مێژووی یەکێتی ، بــۆ تێکڕای مێژووی ئەو یەکێتی‌یە ، یا وەك شاعیر وتوویەتی :

**مەردی باخەوانە**
**کە یەکێتیی ئەدیبانە**
**یەکێتیی ئەدیبانی کورد**
**کاروانی وشەی جوانی کورد**

بەمجۆرە دەستەی بەڕێوەبەری تازە دەستی دایە کارکردنو دیارە کارەکەشی ئاسان نەبوو ، ڕاستە لە هەندێك لایەنەوە دەستــی یارمەتیی بۆ درێژ کرا ، بەڵام زۆر کوسپیش لە ڕێگەدا بوو ، تەواو خـــۆی ڕووبەڕووی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی یەکێتی بینی •

یەکێك لە ئەرکە تازەکانی دەستەی بەڕێوەبەر دەرکردنـــەوەی

گۆڤاری « نووسەری کورد » بوو . رۆتین و گۆڕینی سەرنووسەرو کۆکردنەوەی دەستەی نووسەران چەند مانگی خایاند . کە هاتینە سەر کەرەسەو نووسین ئامادەکردن ، کۆسپە هەرە گەورەکەی چاپەمەنیی کوردی هاتەوە رێگەمان . گۆڤاری کوردی و باری دەرامەت و کۆسپی چاپ و هەڵوێستی ئەم خاوەن چاپخانەو ئەو خاوەن چاپخانە ، یەکێکن لەو چیرۆکانەی لە هەموو گۆڤارێکداو تەنانەت لە هەموو ژمارەیەکی گۆڤاری کوردیدا دووبارە دەکرێنەوە . با ئێمەش جارێکی تر ئەو حیکایەتی « میش »ەی کۆتایی نایەت دووبارە نەکەینەوە . دیارە ئەم حیکایەتە زەمانێکی تریش لەگەڵ چاپەمەنیی کوردیدا هەر هاوسەر دەبێت و ئێمەش بەشێکی زۆرمان هەر پێ براوە .

وا هاتینە سەر چاپ و نازانین کەی ئەم ژمارەیە لە خەم دەڕەخسێت و لە گەرووی چاپخانە دێتە دەرەوە . هەرچۆنێك بێت ، پێویستە چەند وشەیەك دەربارەی رێبازی گۆڤارەکە بووترێت :

لە ژمارەی یەکەمی « نووسەری کورد »دا نووسرابوو :

« گۆڤارەکەمان وەکو بە ناوەکەیا دیارە ، بیروڕای یەکێتیی نووسەرانی کورد دەئەبڕێ و بۆ ئەو ئامانجانە تێدەکۆشێ کە لە پرۆگرامی ناوخۆی یەکێتیدا باسیان کراوە .

پوختەی ئامانجەکانی قۆناخی ئێستامان بریتییە لە برەوپێدان و بەرزکردنەوەی پایەی ئەدەبی کوردی بە هەموو لقەکانیەوە وەکو شیعرو وتارو پەخشان و چیرۆك و بابەتە تازەکانی تری ئەدەب ، تۆمارکردنی دەستنووس و سامانی بڵاونەکراوەی نەتەوەییی کورد ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کلاسیکیمان ، ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە مێژووییانەی لەمەر

کورد کراون بە مـــــاڵ ، کۆڵینەوە لـــە فۆلکلۆرو ئەنترۆپۆلۆژیو ئەتنۆگرافیی کورد ، بایەخدان بە مێژووی زمانو زمانەوانیو دەستووری زمانو فەرهەنگی کوردی ، شیکردنەوەی هونەری کوردی بە مۆسیقاو گۆرانیو شانۆوەو تەرخانکردنی جێگایێکی شیاو بۆ تەرجەمە ، بەتایبەتی شاکارە کلاسیکییەکانی جیهان » •

« نووسەری کورد » لە ژمارەکانی خولی یەکەمیدا هەوڵـــــی بەجێهێنانی ئەم مەبەسانەی دا • ئێستاش ڕێباز هەر ئەوەیــەو هەوڵیان بۆ بەجێهێنانی ئەو ئاواتەیە ، بە ڕێبازێکی پێشکەوتنخوازی سەر بە گــەلو ئاواتەکانی ، سەر بە خەباتی گەلی کورد ، بە خەباتی هەموو گەلی عێراق ، شانبەشانی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلان •

« نووسەری کورد » دەنگێکی‌تری ئەدەبیاتو بـــە ووشـــــە نەخشەکێشانی ئاواتی گەلو ڕەنگدانەوەی خەباتــــــی گەلـــە دژی کۆنەپەرستیو ئیمپریالیزمو سەهیوونیزم • بۆ بنیادنانی وڵاتێکی ئـــاوای پڕ لە خۆشی •

دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان ، لەپاڵ هەموو ئاواتی بەرینــی خۆیدا ، پلانێکی کارو نووسینی هەیە • دەمانەوێ گۆڤارەکەمان لـــــەو پرۆگرامە فراوانەی ژمارەی یەکەمدا زیاتر ڕووبکاتە بەرهەمی ئیبداعی ، واتە شیعرو چیرۆکو نووسین بڵاوکاتەوەو خۆی بکات بـــــە مینبەری زانستی ئەدەبیات ( بە ڕەخنەو مێژوو و تیۆریی ئەدەبەوە ) • دەمانەوێ پلان بۆ چاوەڕوانیی بەرهەم هاتنو بەشداریی نووسەران سەر شـــــۆڕ نەکەین • بەڵکو خۆمان پلانێکمان هەبێتو هەوڵی پڕکردنەوەی ئـــەو کەلێنانە بدەین ، کە لە ڕێڕەوی بەرەوپێشچوونی ئەدەبیاتماندا دەیبینین •

بەڵام ئایا ژمارەی یەکەمی ئەم خولی دووەمەمان ئاوێنەی ئـــەو خواستو ویستنەیەو تەواو بە دڵی ئێمەیە ؟

پێشەکی دەڵێین نەو •• بەڵێ •• نەمانتوانی نەك هەموو بەڵکو بەشی زۆری خواستو پلانەکەمان بێنینەدی •

ڕەنگە بەشی کەمی ئۆباڵی ئەو سەرکەوتنە بکەوێتە سەر ئێمـــە • زۆرتری دەکەوێتە ئەستۆی زرووفێکیوا کە نەمانتوانی بەسەریـــا زاڵ بین ، بەتایبەتی زرووفی چاپەمەنی •

هیوادارین بەرە بەرە بەسەر ئەو کۆسپانـــەدا زاڵ بیــــنو گۆڤارەکەمان تەواو جێگەی خۆی لە دڵی ئێوەو لە ڕیرەوی وشـــەی کوردیدا بگرێت •

پاڵو پشتی ئێمەش خوێندەواری کوردە ، ئەو جەماوەری خەڵکەیە کە نووسینو هۆشو بەرهەممانی بەخت دەکەین •

چاوەڕێی بەشداریی هەموو نووسەرێکی لێهاتوویشین •

« دەستەی نووسەران »

# ئافرەت و جوانی لە شیعری گۆراندا

کەمال مەمەند

دوای شەش ساڵ ئاوارەیی کوڕە لاوێ دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆیان . پێی دەڵێن گەورە کچێك هەیە جار جارەهەواڵی دەپرسێ .. کاتێ چاوی پێ دەکەوێ و سەرنج دەداتە لەش و لاری پێگەیشتووی ئەو یادە کۆنانەی لەسەر تابلۆی خەیاڵی سپی ببوونەوە ، بەرەنگێکی تۆخ وێنەی بەپێزی خۆیان دادەڕێژنەوە .

ئەو کوڕە گەنجە بە منداڵی دڵی بێگەردی خۆی نابووە دەستی ڕۆحی پاکی کچەوە .. ئەوەندە هۆگری ببوو ، هەر ماوەیەك دووربکەوتبایەوە ، تاسەو پەرۆشی دیدار ئارامی لێ هەڵدەگرت .. گەردی غوربەت لە دڵی دەنیشت و لە دەست و پەنجەی گاڵتەو بازی کچە بەولاوە هیچ شتێ نەبوو بتوانێ ئەو گەردە لەسەر دڵی بسڕێ .. هەندێ جار ڕوومەتە نەرمەکانی دەگووشین و شانەو گوڵە باخی لە قژە زەردەکانی دەدا ؛ بڕێ هەلیش لێوە قووت و چاوو برۆ مەستەکانی ماچ دەکردن .

بەڵام ڕۆژگار ئەو کوڕە بەختەوەرەی بۆ ناو دۆزەخی غوربەت و دووری فڕاندو سەرچاوەی ئەم خۆشەویستیە منداڵانە بێ نیازانەی کوێر کردەوە .. وردە وردە یادی کچەکە لەسەر تابلۆی بیرەوەریدا سپی هەڵگەڕان .

بەڵام وائێستە دوای شەش ساڵ دووری گەڕاوەتەوە .

نە ئەو کچە ، کچۆڵەکەی جارانەو ، نە ئەویش ئەومنداڵە نەفامەیە .

بیر لەوسا دەکاتەوەو ، بیر لەئێستاش .

هەل‌و دەرفەتی زۆرو زەبەندی ئەوساو ، تاسەو ئارەزووی یاساغی ئیستا ...

وێنەکانی ڕابردوو ئەوەندە تینی بۆ دێنن ، بەناچاری دەست دەداتە قەڵەم‌و ئەم موعاناتەی بە شیعر دەردەبڕی .. ناوی شیعرەکە [ بۆ گەورە کچێکە ] و شاعیرەکەش کەس نییە ـ گۆران ـ نەبێ ، ئەمەش شیعرەکەیە:

**ئەی گەورە کچی‌دلبەرو شۆخ وەختی منالیت**
**دابووم دڵێکی پوختە بە ئەو ڕۆحە عەفیفەت**
**تۆزێ ون ئەبووی کرپەی ئەبەست عامیلی ئولفەت**
**گەردی لەدلم ئەسری پەلو پەنجەی بازیت**
**گا ئەموشی ئەم ڕوومەتە نەرمە بەبەری دەست**
**گا شانەو گوڵباخم ئەدا لەو قژە زەردەت**
**گا ماچم ئەکرد لێوی قوت‌و چاوو برۆی مەست**
**چەند ساتی وەها ئولفەتی توم بووبو بە عادەت ،**
**تاکو لەپرا کەوتمە ناو دۆزەخی غوربەت**
**کەم کەم سپی‌بوو یادت لەسەر لەوحی خەیالم**
**ئێستاکە لەپاش بوردنی شەش سالە بەعەودەت**
**دلشادم‌و تۆ دەم دەم ئەکەی پورسشی حالم**
**بۆ ڕاستی نەلێم گەورە کچی ، عیشوە سەراپا**
**ئەوسا نیە تا ناخی نیگای دیدە بەری بێ**
**ئەوسا نیە تاناوی قسەش دیوی دەری‌بێ**
**ئەوسا نیە، ئەوسا نیە، ئەوسا نیە، بەخوا !!(١)**

ئەم هاوارەی دوایی ، ئەم دووبارەکردنەوە پڕ لە حەسرەتەی ئەوسا نیە ، ئەوسا نیە ، لە ناخی دڵەوە دەردەچێ ـ گۆران ڕاستی‌یەکە ، دەخاتە ڕوو ، هێڵێکی ڕاست‌و تۆخ لەنێوان دووکات‌و دەمدا دەکێشێ .

یەکەمیان : ماوەی منداڵێتییە ـ گۆران ئەوسا ئەوینو ئولفەتداری کچۆڵان بووە ، بەڵام بێگومان ، بەدڵێکی پاکی منداڵانـــەو نیگایەکـــی بێنیازانەوە ڕەفتاری لەگەڵدا کردوون .. هەرچۆنێ بێ ئەوساش منداڵێکی وریاو زۆرزان بووە .. دەسا لەڕوومەت گوشینو دەسبازیو گوڵەباخ لەسەردانو چاوو لێوی قوت ماچ کردن ، زیاتر ؟

دووەمیان : سەردەمی گەنجێتییە .. ئێستا گۆران بەچاوێکی ترەوە دەڕوانێتە ـ ئافرەت .. چاوی نیازو ئارەزوو .. ئێستاوەك کاتی منداڵی نەفام نییە ، تانیگاکانی بەریو بێ نیاز بن ، یان قســـەکانی تەنهـا دیوی دەرەوەیان هەبێ . ئێستا قسەو نیگاکان دیوی ناوەوەیان هەیە .. دیـوی نیازو ئارەزووی بەکوڵ ، هەڵبەتا ئارەزووی سێکس ...

هەر لەسەردەمی یۆنانەوە دووجۆرە خۆشەویستی بەرامبەر ئافرەت دەستنیشان کراون :ـ

یەکەمیان : حــەز یا خۆشەویستی لەش ، کە ووشەی Cros خوای خۆشەویستی ؛ بۆوەسف کردنی بەکار دێ .

دووەمیان : خۆشەویستی عوزری ( ئەگاپە Agape ) یە . ئـەم جۆرە خۆشەویستییە زۆرجاریش بەخۆشەویستی ئەفلاتونی دەناسرێ . چونکە ئەفلاتون هەوڵی داوە خۆشەویستی لەش ( ئیرۆسی ) بخاتە ژێـر ئەسیری فەلسەفە میسالییەکەی خۆیەوەو ڕەنگێکی ڕۆحی پێبـدا .. لەگفتو گۆی داوەت ـ Bangvet ـ دا ، ئەفلاتون لە زمانی سۆکراتەوە. ڕای خۆی بەرامبەر ـ خۆشەویستی دەردە بڕێ .. بـــەلای ئـــەوەوە. خۆشەویستی جۆرە حـــەزو ئارەزویەکە لەو شتانەی کەنیمانن ؛ لـــەو شتانەی کەلێیـــان مەحرومینو دەستمان ناکـــەون .. واتە خۆشەویستی. لەپێداویستیو موحتاجییەوە پەیـــدا دەبێ ... ( ئیرۆس ) یش بـــەلای

ئەفلاتونەوە خۆی جوان نیە ، بۆیە بەدوای جوانییدا دەگەڕێ .. مرۆڤیش چونکە خۆی ناتەواوە ، ئەوا هەمیشە بەدوای جـــوانیو تەواوییدا وێڵو عەوداڵە .. مادام هەر خوداوەندەکە بێ کەمو کـــورتیو نوقسانی بێ ، ئەوا جوانی تەواو ، جوانی موتڵەق ، جوانی یـــەزدانە .. ئەو پێویستی بەخۆشویستنی کەس نیە ، بەڵام هەموو کـەس پێویستی بەخۆشەویستی ئەوە .. بۆیە مرۆڤی ناتەواوو موحتاج ، لە گەشتە ئەبەدیەکەی بـەشوێن جوانییدا ، دەبێ بەناچاری پلەبە پلە سەربکەوێو ڕوو بکاتە ئاســـمان ، ڕوو بکاتە جوانییەزدانی(۲) .

هەڵبەتا ئێمـــە ووتەی ئەفلاتون قبووڵ دەکەین کە خـــۆشەویستی جۆرێکە لەپێداویستی ؟ بەڵکو پێداویستیەکی جـــەوهەری غـــەریزەییو کۆمەڵایەتییە کە ژیانو بوونو مانەوەی مرۆڤ فەرزی دەکا . بەڵام لەم باوەڕەشداین ئەم پێداویستییە دەتوانرێ لەسەر ئەم زەمینە بەرینە لەژیانی بە کۆمەڵی مرۆڤ خۆیدا دابین بکرێ وپێویست نەکا بە باڵی خەیاڵ بەرەو ئاسمانەکان بفڕین ...

گۆران ، لە هەموو شیعرەکانیدا ، توخنی خۆشـەویستی عـــوزری ناکەوێ بەڵکو بەشێوەیەکی واقیعی دەری دەخا کەخۆشەویستی میســـالی ئەوسانە سەر هەڵدەدا کەیەکێك لەلایەنەکان تووشی بێ هومێـدی دەبێو هیچی دەستگیر نابێو بە ناچاری بووکی خەیاڵ دەڕازێنێتەوە ...

**هەر چەند بتی جوانی ؛ بەعەکسی پـــەرستشم**
**هەر دوورە لێم ؛ لەهەیکەلی حوزنو قەلەندەریم**
**هەرسل ئەکاتو بێ بەشی نازو نەوازشم**
**لاکین چـــە باك ؟ ڕاستییەکـــەی چ دەستەلات**
**مایـــەو مەداری تەسلیەیی عەشقی مـەعنەویم**
**بووکی خەیالی شۆخمە ســـەرگەرمی ئیلتیفات(۳)**

کەواتە ئێمە لە لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی گۆراندا دەربارەی ئافرەت‌و جوانی،پێویست بەوە ناکا بۆ جۆرەکانی خۆشەویستی بگەڕێین..
بەڵام زۆر پرسیاری کە دێتە پێشەوە پێویستیان بە وەڵامدانەوە هەیە .

★ ★ ★

بۆڕوونکردنەوەی تێگەیشتنی دەوری ئافرەت‌و جوانی ئافرەت لە ژیان‌و بەرهەمی گۆراندا ، دیارە هەر دەبێ بۆ هۆنراوەکانی بگەڕێینەوە . بەڵام تەقەلایەك بۆتێگەیشتنی خودی گۆران ، وەك هونەرمەندێك زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بکرێتە سەرەتایەکی پتەو بۆ لێکۆڵینەوەی ئافرەت‌و جوانی لەشیعرەکانیدا ... چونکە ئێمە ناتوانین مەسەلەی جوانی بەشێوەیەکی سەربەخۆو دابڕاو لەژیان‌و هەست‌و بیرکردنەوەی گۆران باس بکەین .. لەسەرەتاوە دەبێ ئەوە بسەلمێنین کە مەسەلەی جوانی لای گۆران هاوکێشەیەکی مەسەلەی ژیانە بە هەموو قووڵی‌و بەربڵاوییەکەوە.. گەڕان بەدوای جوانیدا ، گەڕانە بەدوای دۆزینەوەی مانایەکی باشترو ، شێوەیەکی باشترو جوانتری ژیان .

بە داخەوە هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆمان دەربارەی ژیانی گۆران ، بەتایبەتی لە ماوەی منداڵێتیدا لەبەردەستدا نیە .. جگە لەو زانیاریانەی خۆی بۆ ـ حسێن علی شانۆف ـ ی ناردوون‌و ئەویش لەلێکۆڵینەوەکەیدا پشتی پێ بەستوون[٤] مامۆستای نەمر ، ـ ڕەفیق حیلمی ـ ش ، چەند دێڕێکی کەم بەڵام بەنرخی لە ژیانی گۆران نیشان‌داوە[٥] .

جگە لە مانە تاقە سەرچاوەیەکی گرنگمان هەیە کەئەویش پارچە پەخشانێکی گۆران خۆیەتی بەناوی ( اسفی ماضی‌و ئەندێشەی استقبالم[٦] ) . کە لە تەمەنی پازدە ساڵیدا ، کاتێ قوتابی سەرەتایی بووە لە هەڵەبجە نوسیویێتی‌و لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن‌دا بڵاوکراوەتەوە .

ئێستا ئێمە بۆ بەدەست هێنانی وێنەیەکی خۆیی گۆرانی هونەرمەند، بشت بەو سەرچاوانە دەبەستین و لەگەڵ هۆنراوە کانیدا پێکیان دەگرینەوە. لەپێشەوە بەشیکردنەوەیەکی پارچە پەخشانەکە دەست پێدەکەین .

* * *

دیارە جوانیخوازی و تەنانەت جوانی پەرستیش ، شتێکی ئاساییە . بەڵام ڕەنگە ئەم کارە برێك سەیر بێتە بەرچاو ئەگەر بزانین ئەو ئەویندارو سەوداسەری جوانییە هەر ئەو گەنجەیە کە لە هەرەتی لاوێتیدا هاوار دەکا :

**ئاخ مردن !**
**ئاخ مردن !**
**بۆ ناتگەمێ ؟**
**بەخوا مردن بۆ من بە کامی دل گەیشتنەو ، لە غمم خەلستنە**
**بۆچ ئەگەر هەموو بەحرە موحیطەکان زووخاو بوونایە**
**بە قومێ وشکم نەئەکردن ؛**
**حاصیلاتی هەر پێنج قطعەکە غمم بوایە خواردنیم بە ژمێ**
**بە کەم نەئەزانی ؟**

کاتێ بەووردی پارچە پەخشانی ـ ئەمەفی ماضی و ئەندیشەی استقبالم ـ شیدەکەینەوە ، هیچ هۆیەکی ماددی تایبەتی بۆ ئەو خەمە خەمەتەو ئازارەکانی گۆرانی گەنج نادۆزینەوە .. بەڵکو بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خەمەکە زیاتر خەمێکی ـ فەلسەفییە ؟ واتە خەمیکە لە هوشیاری فیکری و بیرکردنەوەی گۆران دەربارەی مانا و مەبەستی ژیانەوە هەڵقوڵاوە .. ژیان بەهەر سێ دوورییەکانیەوە :

ڕابردوو ، ئێستاو ئایندە . گۆران لەو پارچە پەخشانەدا ـ هەر

وەك بە ناونیشانەکەیدا دەردەکەوێ ، بەراورد لـــەنێوان ڕابردووی بەفیڕۆدراوو ئەندێشەی ئایندەی نادیاریدا دەکا ...

ئەو بۆیە غەمبارە چونکە بەلای ئەوەوە :

[ ڕابواردنی عومری ئەم دەورەی سەعادەتە ، هەروەك سـەفەری دوورو درێژی توجارەتە ، سەرمایەی ئەم توجارەتە یش تەحسیلی علمو مەعریفەتە ـ کە ئەم تەحصیلەیش لە حاڵەتی صەباوەتو ، شەبابەتـــدا تەواو دەکرێ ] .

واتە : تەمەن وەك سەفەرێکی بازرگانی دوورو درێــژ وایــە ، سەرمایەی مرۆڤ بۆ بەختەوەری خۆی لەو سەفەرەدا دەستی بکــەوێ زانستو زانینە ؟ ئەویش دەبێ لە سەرەتای سەفەرەکەدا ، واتە لە ماوەی منالێتیو گەنجێتیدا بەدەستبهێنرێ .. ئەمە ڕوانگەی گۆرانی گــەنجە بۆ ژیان ؟ نهێنی ژیان هەژێنیشی لەوەدایە کە ئــەو خــەریکە شریتی سالانی تەمەنی لاوێتی دەپێچێتەوەو هیچ دەسکەوتێکی زانینی بە دەست نەهێناوە .. تەمامی زیندەگانی ئەو ، وەك خۆی دەڵێ ، بەتێنی گەرمـای نەزانینو جەهالەت هەڵقرچاوە ...

ئەمە دیمەنی تەڵخی ڕابردووە .. ئەو ڕابردوەی تــازە تێپەڕیو وەك تفی ڕۆکراو قوت نادرێتەوە .

ئێستاش بە تەواوەتی وەخت لە دەست چووە ( لـــە ناعیلاجــی چاکترە ) . ئەو دەتوانێ هەوڵو تەقەلا بداو موتالا بکاو خۆی فێرکا .. گەرچی ئەمەشیان مەحاڵە ، چونکە گۆران دەڵێ :

[ با من فکریشم کرابێتەوە هەر ئەتوانێ قبوولی تەربیە بکا ، ئەگینـا سەربەخۆ لە هیچ ناگا .. خولاسە مێشکی مــن وەك فۆتۆگـرافی ژەنگ

گرتووی جەڕ تێکچوو وایە .. عەکسی غایەی صورەتی زیبای موتالەعە ـ یە تەواوی جەزب ناکا .. لازمە وەستای بەدیققەت کە موعەلیمی صاحێب سەعادەت بێ . بە جۆرێ دروسی بە مەنفەعەت ، ئەم ژەنگە لابەرێو لـە فابریقەیی مەکتەبا بەئەسبابی نەصایحی خەیرییە ئەو جەڕە چاك بکاتەوە.. کەوای لێهات دەست لەم خەیاڵە هەڵگرتن ، صرف نظر لە عەویـــزی چاکەی وڵات ( وطن ) کردن زۆر اقبال بلندییە ] .

گۆران لە پلەیەکی باڵای هۆشمەندیدایەو ، دەزانێ کـــە مێشکی کراوەتەوەو زۆر بە ـ چاوێکی ڕەخنەگرانە سەیری ژیانو بوونی خۆی دەکا ... بەڕابردووی خۆیدا دەچێتەوەو هەنگاو دەنێتـــە ســنووری هەرێمی داهاتوویەوە .. ئەو مێشکی خۆی دەشوبهێنێ بەکامێرایەکـــی ژەنگ گرتووی جەڕ تێکچوو کە ناتوانێ وێنەی مەبەستە جوانەکانـــی نووسینەکان عەکس بکاتەوە ؟ واتە مێشکی ناتوانێ ناوەرۆکی ئەو شـتانە وەربگرێ کە دەیانخوێنێتەوە .. بۆیە پێویستی بــــە مامۆسـتایەکە فێری‌بکاتو بەجۆرێ دەرسی سوودبەخش ڕەنگی کامیرای مێشـــکی بشواتەوەو بە ئەسبابی ئامۆژگاری چاك جەڕەکانی بخاتەوە جێی خۆی .. بەڵام مادام ئەم جۆرە مامۆستایە شك نابا و دەبێ بە تەواوی پشت بە خۆی ببەستێ ، وای بە باشتر دادەنێ چاو لـــەم بپۆشێو ســەری خـۆی نەیەشێنێ .. لێرەدا گۆران دەگاتە ئەم نوختەی ڕەشبینیو بێ هومێدییە.. بەڵام لێکدانەوە مەنتیقیەکەی هەر بەردەوامە ، ئێستا ڕەگەزێکی تازە دێتە ناوەوە .. ڕەگەزێکی هەرە گرنگ ؟ گۆران دەڵێ :ـ

[ بەڵام چونکە ئەم وڵاتە بەسەزمانە ، ئەمدایکە مشفقمانە ، چارەڕوانە بۆ تێکۆشان ، موحتاجی یاریدەدانەو ئیشم مەعلوومە کە ( لیس للانسان الا ما سعی ) مەقصەد لە هەوڵدانە بۆ تورەقی وەتەنو خۆوڵاتیکان .. ئـــەم

ئایەتە جەلیلە کە کەلامی خوای تەبارەك‌و تەعالایە ، وەك لغاوی توند ڕاکێشراو ، ولاغی خەیاڵم لە بیری زوورتر دەگێڕیتەوە ] .

ئەمە گەورە ترین گەوهەرێکە گۆران لەبنی گۆمی بیرکردنەوەیدا دەری دەهێنێ‌و گوری ووزەو تێکۆشانی لێ‌وەردەگرێ .. گۆران خاوەنی خاك‌و گەلێکە ؟ ولاتێکی بەسەزمان کەوەك دایکێکی جگەرسۆز چاوەڕێی تێکۆشانی کوڕەکانیتی .. مەبەستی ئایەتی ( لیس للانسان الا ما سعی ) هەر ئەوەیە کە مرۆف بۆ ـ پێشکەوتنی نیشتمان‌و هاوولاتەکانی هەوڵ دا ، گۆران بەم بیرە بەرزە ، ڕێبازی ڕوونی خۆی دەدۆزێتەوەو هومێدێکی هەمیشە تازەبۆوە تاریکایی بەرچاوی ڕووناك دەکاتەوە .

ئێمە لە ئەنجامی شیکردنەوەی ئەم پارچە پەخشانەدا دەڵێین :

گۆرانی گەنج هەر لە تەمەنێکی زووەوە هوشیاریەکی گەورەی بەرامبەر ژیان بەدەست هێناوەو ، وەك خۆی دەلێ ، فیکری کراوەتەوە.. گۆران لەم پەخشانەدا لە حاڵ خراپی تایبەتی خۆی نادوێ ، بەڵکو لە فەلسەفەی ژیان دەدوێ ؟ فەلسەفەی ژیان سەبارەت بە گەنجێکی مێشك‌کراوەی ناو میللەتێکی هەژاری دواکەوتووی بەسەزمان ..

هەن دەڵێن : مرۆڤی هونەرمەند ئازارو ژان دروستی دەکا بەلام ئەمە مەحاڵە .. ئەگەر بێت‌و ئەم ئازارو ژانە نەگۆڕێ بە ئازارو ژانێکی فەلسەفی ؟ واتە بیرکردنەوەو لێکدانەوەو هۆشیاری لەگەڵدانەبێ(٧) .

هەزاران هەن لە ئازاردا دەژین‌و کەچی بارەکە هەرچەند قورس‌بێ ، دەیکێشن‌و نقەش ناکەن .. چونکە ئەوانە هوشیاریەکی وایان نیە ئازارەکەیان تێ‌بگەن‌و ڕەگەکانی بناسن ؟ لەمەوە ئاواتێکی واش لەمێشکیاندا درووست نابێ ، بۆ یاخی‌بوون لەوەی هەیەو بەدەست هێنانی باشتر ، باڵیان پێوەبنێ .

ئازار ، گەر کەمیش بێ ، کاتێ بیرکردنەوەو هۆشمەندیەکی شمولی لەگەڵدا دەبێ ، گەورەترو کاریگەرتر دەبێ‌و مانای تازەتریش بە ژیان دەبەخشێ‌و دەوڵەمەند تری دەکا .

خەم‌و ئازاری گۆرانیش لەم چەشنەیە .. ئەوە نیە خۆی لەیەکێ لەشیعرە کۆنەکانیدا دەڵێ :

**زیاتر سەبەبی عەقڵ‌و شعورە خەفەتی مــن**
**بۆ غەفلەت‌و نسیانە هەموو نۆشی شەرابم ! (٨)**

ئەو خەمەی لەو پەخشانەشدا دەری بڕیوەو ، لە ئاوانـــی دادو فریادی مەرگ دەکا ، سەبەبەکەی زیاتر عەقڵ‌و شـــعورە .. لـــەم بیرکردنەوە قـــووڵەیدا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ گـــۆران تا ڕادەیەك مرۆڤێکی خاوەن هیواو ئاواتی گەورە بووە .. ئاواتی گۆران بۆ ژیانێکی بەرزو پڕ ماناو بەسوود هەر لەسەرەتای منداڵییەوە ، وەکو سەرچاوەیەکی کوردستانیی بەخوڕ لە ناو دڵ‌و دەروونیدا هەڵقوڵاوە .. بەڵام ئەم ئاواتە گەورەیەی لە گەڵ واقیعێکی ماددی سەختی ژیانی پڕ لە ژانی گەلەکەیدا بەرەوڕوو بۆتەوە ..

ئەگەر ئێمە هۆیەکانی خەمی گۆران ، لەم پەخشانەدا ، لە گـــەڵ واقیعی ڕاستی ژیانی خۆی بەراورد بکەین ، هەست بە کەلێنێکی گـــەورە دەکەین .. گۆران ، تا مردنی باوکی لەساڵی ١٩١٩دا ، تاڕادەیـــەك لە خۆش گوزەرانی‌دا بووەو ، ئەو دەرفەتەی بۆ خوێندن‌و فێرکردنی ئـــەو خوڵقاوە، بۆ لە هەزارا یەکێکی خەڵکی وڵاتەکەی نەخوڵقاوە.. لەو کاتەدا کـــە ڕابردووی خـــۆی بە ( بطال حطال ) ناو دەباو داخ بۆ ئـــەو کاتـــە بەسەرچوە دەخوا کە وەك تفی ڕۆکراو قوت نادرێتەوەو هـــەلی فێربون‌و زانست وەرگرتنی لە کیس چووە ، لەو کاتەدایە ڕۆشنبیریەکـــی وای

وەرگرتوە بتوانێ ئەم بیرکردنەوە بەرزەی هەبێو بەم شێوە نووسینە بەرزە دای بڕێژێ .

سلێمان بەگی باوکی گۆران کە لە جێگای عبداللە بەگی باپیری گۆران لەلای عثمان پاشای جاف کاتب بووە ، هەر لە منداڵییەوە گۆرانی فێری خوێندنەوەو نووسینی زمانی فارسی کردوەو ، لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەی تورکەکانیش لە هەڵەبجەدا ، گۆران بۆنە یەکێك لەشاگردەکانی ئەو قوتابخانەیە .. هەر ئەم پارچە پەخشانە بۆمان ڕوون دەکاتەوە تا چڕاددەیەك توانیوێتی شارەزاییەکی باش لەزمانی عەرەبیو فارسیو دەرسی دینو تەنانەت لەجوگرافیاشدا بەدەست بێنێ .. ڕاستە دوای مردنی باوکی لە ١٩١٩داو ، کوژرانی محمد بەگی برای لە ١٩٢١داو دوورکەوتنەوەی خۆی لە هەڵەبجە ، تووشی گەلێ ئازارو دەردی سەری بوەو زۆر جار ئاسۆی ڕووناکی ژیانی ڕەش داگەڕاوە .. تەنانەت [ لە زەمانی باوکیشیا گەلێ ترشو تاڵی ئەبینێ بە تایبەتی لە بەهاری ١٩١٩وە هەتا پایزی ئەو ساڵە کە بەر تالانی لایەنگرەکانی ئینگلیزدەکەونو بەپەلە پروزەکێ کۆچ ئەکەنو خۆیان ئەگەیەننە جێگا بەرزو سەختەکانی شاخی هەورامان ][٩] . بەڵام گۆران وەك خۆی بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی باس کردووە [ ئەو ڕۆژە ڕەشانە کاریان لەشەقامی ڕاستی ژیانی نەکردوە ، ( واتە گۆران ) لەو ڕۆژانەدا کە پێیان ئەڵێ ڕەش ڕەنگە ڕووناکی لە دڵیا لە ڕۆژانی خۆشی زۆرتر بووبێ ، یاخود لە ـ هەر دووکیانا تاریکیو ڕووناکی وەك یەك نوورەی کردبێ ][٩] .

ـ حسێن علی شانۆف ـ یش لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەسەرهاتی ژیانی گۆران بەدەسخەتی خۆی دەڵێ :

[ عەبدوڵڵا گۆران هەر لەسەرەتای منداڵییەوە دڵی پڕ بوە لە خۆشەویستی ژیان‌و ، تامەزرۆی ڕووناکی‌و زەردەخەنەو شاعیرێتی بووە .. فەلسەفەی دنیای دوابڕاو ، ئەو دنیایەی بۆ سلێمانیش نەما ، نەیتوانیوە گۆران لە خۆشەویستی ـ شادی ژیان دابڕێ‌و گەرد بخاتە سەر دڵی بە سرووش‌و جوانی پەروەردە بووی ][10] .

ئەم هەموو خۆشویستنە قووڵەی ڕووناکی و ئەم گەشبینی‌و هیوا زۆرە بەژیان ، هەر لە کاتێکی زووی منداڵێتیەوە ، گۆرانی کردۆتە شێت‌و شەیدای هەموو ئەو شتانەی جوان‌و پیرۆزو ڕووناکن .. گۆران ویستوویەتی بوونی هوشیارانەی خۆی بسەلمێنێ‌و ئەو ژیانە بەدەست بێنێ کە دەیەوێ ، نەك ئەوەی کە هەیە .. بەڵام دیارە بەدی هێنانی ئەو ئاواتەی چوار چێوەی ئەو کۆمەڵ‌و دەورو بەرە سنووری بۆ داناوە کە گۆرانی تیا ژیاوە .. ئەو نەیتوانیوە موعجیزە دروست‌بکاو هەموو شتەدزێوو ناشیرینەکان هەڵگێڕێتەوە .. بەڵام لە شیعردا ئەمەی کردووە . گۆران دیوی تاریکی کۆمەڵەکەی ، کۆمەڵی کوردەواری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کە زۆر بە سەختی‌و بەخەستی لەژێر قورسایی بیرو ڕێ‌و ڕەسمی دەرەبەگایەتیدا بووە ، پێچاوەتەوەو ، لە ڕووناکییەکانی هیواو ئاواتەکانی ناو دڵی ، وەك چارەسەرێکی ڕۆمانسیانە . جیهانێکی تازەی دروست کردوە ؟ جیهانێك بتوانێ تینوێتی خۆی بۆ جوانی‌و ژیانێکی باشتر پێ بشکێنێ .

گرنگ ئەوەیە گۆران هەر لەگەڵ ئەو هەستی جوانیپەرستییەدا ، هەستی هونەر دۆستی‌و ئینجا هونەر پەرستی لەلا پەروەردە بوو .. گوتم گۆران هەر لە چوارچێوەی سنوورەکانی کۆمەڵەکەی‌و دەورو بەرەکەیدا دەیتوانی بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانی هەنگاو هەڵگرێ .. ئەو

نینوێی زانین‌و ڕۆشنبیری بوو ٠٠ له کۆمه‌ڵ‌و ده‌ورو به‌ره‌که‌ی ئه‌ویشدا له شیعر به‌و لاوه هیچ شتێ نه‌بوو ئه‌و تینوێتییه‌ی بگرێته خۆی ٠٠ هه‌ر له‌زوویه‌که‌وه به هۆی باوکییه‌وه ، گـــوێی به ده‌نگ‌و ئاوازو ڕازی شیعر کرایه‌وه ٠٠ باس‌و خواسی سنعه‌تی شیعرو ، لێکدانـه‌وه‌ی تێکسته شیعرییه‌کان ( له‌لایه‌ن باوکییه‌وه ) سه‌رنجی گۆرانی گه‌نجـی ڕاکێشا ٠ له شه‌ش ساڵییه‌وه له‌گه‌ڵ منداڵانی هاوڕێی‌دا به شـیعر شه‌ڕه جنێـوی ده‌کرد(١١) ٠ به کورتی هه‌ستی هونه‌ر دۆستیش تێکه‌ڵ به هه‌ســـتی جوانی په‌رستی بوو ؟ هه‌تا له‌زمانی ده‌ربڕیندا ، له‌زمانی شـــیعردا ، به‌جۆرێك ئاوێته‌ی یه‌کتر بوون ، که ئه‌سته‌مه بڵێین کامه هونه‌ره‌که‌یه‌و کامه ـ جوانییه‌که‌یه ٠ به واتایه‌کی تر ، گۆران توانی شیعر بکاتـــه ئامرازێك بۆ ـ ده‌سه‌ڵات گرتن به‌سه‌ر جیهاندا گه‌رچی له سه‌ره‌تاوه بـه شێوه‌یه‌کی سه‌لبیش بێ ؟ واته ده‌سه‌ڵاتگرتن به سه‌ر جیهانی واقیـع‌دا نا ؟ به‌ڵکو ئه‌و جیهانی خه‌ون‌و جوانییه‌ی له خه‌یاڵی خۆیدا نه‌خشـــه‌ی بـۆ کێشابوو ٠

**هـــه‌ر زه‌ڕڕه‌یه‌ك له خوێنـــی ده‌ماری پـــر ئاگرم**
**هه‌رچی حوجه‌یره‌کانی هه‌یه کووره‌یـــی دلـــم**
**شیوه‌ی عیشق‌و جازیبه‌یه بۆ جوانـــی ، یا قه‌لـــه‌م ،**
**قابیل نیه فه‌راغه‌تم ، حه‌تتا کـــه بشـــرم(١٢)**

جوانی وقه‌ڵه‌م ، واته جوانی‌و شیعر به‌یه‌که‌وه ، یان ئه‌م نا ئه‌ویان ، ئه‌و سه‌رچاوه پیرۆزه‌ن که‌دڵ‌و ده‌ماری ئاگراوی‌و هه‌موو زه‌ڕه‌یه‌کـــی خوێنی گۆران پڕ له عیشق‌و جازیبه ده‌که‌ن ؟ عیشق‌و جازیبه‌یه‌کـــی‌وا که ته‌واوی ژیانی گۆرانی پڕ کردۆته‌وه‌و ، ده‌رفه‌تێکی بۆ نه‌هێشتۆتـه‌وه ئه‌گه‌ر مردن نه‌بێ ٠٠ ئه‌گه‌ر گۆران له دنیای واقیعی جوانیدا ، جوانی به‌ر هه‌ست‌و به‌رده‌ست ، تێر نه‌خوا ، ئه‌وه دنیای هونه‌ره‌که ، دنیای شیعر

خۆی خالقێتیو دەتوانێ بەو جوانییەی لەوێدا ـ دەینەخشێنێ خۆی مەست بکاو وێڕای ئەمەش کەسێتی خۆی تێدا بدۆزێتەوەو مانایەك بە ژیانی ببەخشێ ••

گۆران خۆی ناسیوەو نرخی خۆی وەك هونەرمەند زانیوە •• بۆیە هێندەی شێتی جوانییە ؟ هێندەش شێتی شیعرە :

**بۆ سەیری جەمال کردنی دنیایی بەیانی**
**هێشتا شەوی زۆر مابوو کە من کەوتمە سەحرا**
**وەك شێت ، بەڵام شێتی شیعر ، شێتی جوانی(١٣)**

ئەو زانینو زانستەی گۆران لە تافی لاوێتیدا داخی بۆ دەخوا ، لەدواییدا لە وشەی ( شیعر )دا جێی خۆی دەکاتەوە •• شیعر دەبێ بە هاوتایەکی تر بۆجوانی ؟ بۆ ژیان • گۆرانیش کە هەر لەسەرەتاوە بیری لەوە کردۆتەوە ، بۆ خەڵكو بۆ خزمەتی دایکی نیشتمان تێبکۆشێ ، زۆر بەعەزرەتەوە بووە خەڵکیش لەئەو بگەن ؟ زۆر بەپەرۆشەوە بوە نرخی هونەرەکەی بزانن ؟ هونەری ـ گۆران ـ یك کە ( بۆ شیعرو ئەدەب زاوە )[١٤] !!•••

موخابین ! کەس ئەمەی نەکردوە •• ئەویش هەر دەروێش عبداللەیەکی دیکەبووە •• بەڵام ئەو نهێنیەکەی زانیوە •• نهێنیی دواکەوتوویی ئەو کۆمەڵەی قەدری کەسانی وەك عبدالله گۆرانو دەروێش عبدالله نازانێ •• بۆیە بە نرخ زانینی خۆی لەلایەن خۆیو لەلایەن پاشەڕۆژەوە ئیکتیفای کردووەو قەت تووشی ڕەشبینی نەبوە !!

★ ★ ★

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە بپرسین : ئەو جوانییەی گۆران بەشوێنییدا دەگەڕێ ، لە چدا بەرجەستە بوە ؟

ئەو هەستە ئاگراوی‌و بە کوڵەی جوانیپەرستی چ بابەتێك هەیە بە خۆی بگرێ ؟گۆران بابەتەکانی شیعرو جوانی لەکوێندەرێ سۆراغ دەکا ؟!

یەکەم جۆری پەیوەندی مرۆڤ بەجیهانی دەورو بەریەوە ، بە هۆی هەر پێنج حەواسەکانیەوە پێك‌دێ •• بە هۆی بینین‌و بیستن‌و بۆن کردن‌و دەست لێدان‌و تام کردنەوە •• هەر لەمنداڵییەوە پەیوەندی مرۆڤ بە دەورو پشتەکەیەوە دەبێتە پەیوەندیەکی ژیان ئامێز •• لەکاتێکدا حەواسەکانی مرۆڤ جوانییەکان‌و سیفاتەکانی گەرمی‌و ساردی‌و فێنکی‌و تاڵی‌و سوێری‌و شیرینی ••• هتد دەرك پێ‌دەکەن ، ئەوا خۆشییەکی زۆر لەم دەرك پێکردنە وەردەگرن •• هەر لەوکاتیشدا ، بە هۆی ئەم تەجرەبەیەوە ، دەوڵەمەندتر دەبن‌و زیاتر نەش‌ونما دەکەن •• تا لە ئەنجامدا مێشکیش پەرە دەستێنێ‌و مرۆڤ دەگاتە ئەو ئاستەی سەرباری خۆشی وەرگرتن ، لە تاقیکردنەوەکانییەوە فێر بێ‌و بیر لە شتەکان بکاتەوە •• بیرکردنەوە لەشتەکان مانای بەستنەوەی یەکێکیانە بە ئەوانی ترەوەو بەرپێرەوو ئامانجی ژیانی مرۆڤەوە ؟ مانای گەڕانە بەشوێن هۆو ئەنجامدا ؟ لەدواییشدا مانای وەرگرتنی هەر هۆو ئەنجامێکە لە چوار چێوەی یاساکانی پەرەسەندنی ژیاندا بە گشتی‌و یاساکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا بە تایبەتی •

پەیوەندی جوانی خوازانەی گۆران بە جیهانی دەورو بەریەوە ، لە قۆناغی ڕۆمانسیەتدا ، پەیوەندیەکی هەستی ( حسي )یە •• پەیوەندییەکە بە هۆی حەواسەکانەوەو بە ئامانجی تێرکردنیان •• مەودای ئەم پەیوەندیەش جوانی سروشت‌و جوانی ئافرەتە •

بەڵام خاسیەتی گرنگی ئەم پەیوەندییە تەنیـا لایەنە هەستیەکەی نیە ؛ بەڵکو لایەنە هونەرییەکەشیەتی .. واتە هەر لەسەرەتاوە گـۆران لەڕوانگەیەکی هونەرمەندانەوە هەڵس‌و کەوت لەگەڵ بابەتەکانـــی جوانیدا دەکا .. هەر لە سەرەتاوە جـوانی‌و هونەر لـە یەکایەتییەکی هارمۆنیداردا تێکەڵ دەبن .

ئەگەرچی گۆران جوانی پەرستەو هـەموو جوانییەکی خـۆش دەوێ ، بەڵام تەبعێکی هونەرمەندانەی تایبەتی هەیە .. گەڕان بەشوێن شتی دڵگیرو نایاب‌و پەنهاندا ، ئەو شتانەی کە ئەگەرچی دیارو بەرچـاو نین ، بەڵام نهێنییەکی گەورەی جوانی لە دوو تـوێی بوونیانـدا حەشارداوە ، خولیای رۆحی جوانیپەرستی گۆران‌و زەوقی بەرزوبـاش پەروەردەکراوی ئەو دەردەخەن ..

گۆران بە هەستی حەساس‌و زیرەکانەی خۆیەوە ، لەنێو دنیـای جوانییشدا ـ هەمیشە بۆ جوانترو چوانترین دەگەڕێ . سۆراغی نموونە دەگمەن‌و نایاب‌و هەڵبژاردەکان دەکا ، ئەو نموونانەی لە بارانیاندا هەیـە تینوێتی گیانی نەسرەوتی ئەو دابمرکێننەوە :

**گیانی من بۆ تـەڵێ وەنەوشـە پەرۆشـە**
**کە لە ژێر سێبەری تووترِکا خامۆشـە**
**لە هەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەر بـەیان !**
**ئـەخاتە دڵی من هـەستێکی سپی‌و جـوان !**
**لە تەختێك هەڵدەستێ هەزارو یەك نەغمە**
**ئەوەیان شیرینتر دێتە گوێم زۆر نزمـە !**
**کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شـەو**
**لەبنیا بلەرزێ مرواری زیـخ‌و چـەو**
**جوانترە لە لای من لەدەریای بـێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەرتیشکی خۆر ، شلپ‌و هوڕ(١٥)**

ئێمە ئەگەر لێرەدا بەراوردە ئیستاتیکییەکەی ( کانت )[١٦] بەکار بێنین : دەڵێین گۆران زیاتر بۆ شتە ( جوان )ەکان دەگەڕێ ، نەك بۆ شتە مەزنەکان .

واتە ئەوشتانەی هێمن‌و ناسك‌و خامۆشن ، نەك ئەو شتانەی گەورەو بەربڵاوو بە هەراو هۆریان .

بەڵام ئەو شتە بچووك‌و خامۆشانەی گۆران هەڵیان دەبژێرێ ، لە ( مەزنی ) بێبەش نین .. خۆ ئەگەر ئەوانە بەڕواڵەت‌و قەوارەو دەنگ گەورە نەبن ، ئەوا لەماناو واتادا گەلێ مەزنن .. ئەو ماناو واتایانەی تەنها مرۆڤ دەتوانێ لەوجودی شتە بچووکەکانی هەڵێنجێ ، یان بیداتە پاڵیان .

گەڕانی گۆران بەدووی ئەوشتە بچووك‌و هێمن‌و شاراوانەدا ، گەڕانی ڕۆحی تینوو نەسرەوتی گۆرانە بە دوای دۆزینەوەی مانایەکی تازەدا بۆ شتەکان .. واتە دۆزینەوەی مانایەکی تازە بۆ پەیوەندی مرۆڤ بەجیهانی دەوروو بەرییەوە ؟ بۆ ژیان .. هەر لەو کاتدا سەرنجی وردی گۆران لە دەوروو بەرەکەیو ، دۆزینەوەی ئەو نموونە مات‌و خامۆش‌و لە سەرنجی درشت بەدەرانە ، ئەو ڕاستیە دەردەبڕێ کە گۆران هەمیشەو لە هەر لەحزەیەکدا ، چ لە گەشتێکی دوورو درێژی هەورامانیدا بووبێ یان لە گوزەر کردنێکی لامسەرلاییدا ، خاوەنی زەین روونییەکی ئیستاتیکی باڵا بووەو ، هەستی جوانیپەرستانەی ئەو لە چالاکییەکی ئەوتۆدا بوە کە کامیرای سەرنجی بچووکترین وێنەی سەرنج ڕاکێشی بەخەسار نەداوەو ، هەست‌و زەوقی هونەرمەندانەشی خێرا قۆزتویەتیەوەو گوازتویەتیەوە بۆ ناو ئەلبوومی ڕازاوەی هونەری جوان .

ڕاسته گۆران جوانی سروشت‌و جوانی ئافرەت دەکاتــه مەودای هەست‌و هەناسە ڕۆمانسییەکانی • بەڵام لەنێو ئــەو دوو جوانییــەدا جیاوازییەکی زۆر هەیە •• مرۆڤ لە هەڵس‌و کەوت کردن لـەگــەڵ جوانی سروشتدا ئازادو سەربەستە ؟ بەڵام جوانی سروشت دەشێ لــە هەموو شرێتێکدا هەر بەو چەشنە خۆی دووبارە کاتەوە •• بەبێ ئەوەی گۆڕانێکی گەورە هەست پێ بکەین •• چونکە دەتوانین بڵێین سروشت دیوی ناوەوەی نیە •

سروشت ، ئەگەر بێ گیانیش نەبێ ، واتە ژیان‌و زیندوویەتــی هــەبێ - ئەوا بێ‌گومان بێ‌دڵە •• بێ هەست‌و ســۆزو پەرۆشــەو ناتوانێ ڕۆحی مرۆڤ بشکێنێ •• ئەو تینوێتییــەی لە جەوهــەردا لەپێداویستی دابین‌کردنی ژیانێکی کۆمەڵایەتی ساغ‌و شــادو هێمنــەوە هەڵدەقوڵێ •• بناغەی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییەش پەیوەنــدی نێــوان مرۆڤێك‌و مرۆڤێکی‌ترە ؟ پەیوەنــدی نێــوان ژن‌و پیــاوە •• مارکس لەدەستنووسە ئابووری‌و فەلسەفییەکانی ١٨٤٨یدا دەڵێ : [ پەیوەنــدی ڕاستەو خۆو سروشتی‌و پێویست لە نێوان مرۆڤێك‌و مرۆڤێکی تــردا ، پەیوەندی‌نێوان ژن‌و پیاوە •• لەم پەیوەندیە چەشنییە سروشتییە دایــە کە پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە ، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ، دەبێتــە پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوەو ، پەیوەنـدی مرۆڤ بە مرۆڤەوە بــە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەبێتە پەیوەندی ئەو بە ـ سروشتەوە • دەبێتــە سنوور دانانی سروشتی خۆی لە خۆیدا •• لەم دیاردە بەرچاوییــەدا ، ڕادەی بوونی ماهیەتی ئینسانی بەسروشت سەبارەت بــەمرۆڤ‌و ، ڕادەی بوونی سروشت بەماهییەتی ئینسانی ئینسان بەدیار دەکــەوێ •• لــە سەرەتاکەی ئەم‌پەیوەندییەوە ، دەتوانین حوکم بەسەر ئاستی ڕۆشــنبیری

مرۆڤدا بدەین •• لە شێوەی ئەم ڕۆشنبیرییەوە دەردەکەوێ تا چڕادەیەك مرۆڤ بەنیسبەت خۆیەوە بۆتە بوونێکی چەشنی ، بۆتە ئینسان و بەم جۆرە هەستی بەخۆی کردوە • چونکە پەیوەندی پیاو بەژنەوە سروشتیترین پەیوەندی نێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی ترە • لەم پەیوەندییەدا ئاشکرا دەبێ تا چڕادەیەك پێداویستی مرۆڤ دەبێتە پێداویستییەکی ئینسانی ؟ واتە تاچ ڕادەیەك مرۆڤەکەی تر وەکو مرۆڤ دەبێتە پێداویستی • وە تا چ ڕادەیەك لەبوونی هەرە تاکی خۆیدا ، هەر لەوکاتدا ، دەبێتە بوونێکی کۆمەڵایەتی ][17] •

مەبەستەکە بە کورتی ئەمەیە :ـ

پەیوەندی نێوان ژن و پیاو سروشتیترین پەیوەندی نێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی ترە ؟ جا هەر چەند ئەم پەیوەندییە ببێتە پەیوەندییەکی سروشتی ئەوەندە مرۆڤ مرۆڤایەتی خۆی دەسەلمێنێ •

دیسان ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی چەشنییە •• پەیوەندییەکە ـ لە نێوانی مرۆڤ و مرۆڤدا ، جا هەر چەندە ئەم پەیوەندییە سروشتییە ببێتە پەیوەندییەکی چەشنی ـ ئینسانی ـ ئەوەندەش دەبێتە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی •

شاعیری ڕۆمانسی ئینگلیزی ( شیلی ) لە (فەلسەفەی خۆشەویستی)دا بەشی یەکەمی ئەم تێگەیشتنە ، بە زمانی شیعر ، بەم جۆرە دەردەبڕێ :

سەیر کە چیاکان : ئاسمانی بەرز ماچ دەکەن
شەپۆلەکان یەکتریان لەباوەش کردووە •
خۆرەتاو زەوی لە ئامێز دەگرێ
مانگە شەو دەریا ماچ دەکا !
بەڵام هەموو ئەم ماچانە چ نرخێکیان هەیە
ئەگەر تۆ من ماچ نەکەی ! (18)

لێرەدا ئەو پەیوەندیانـــەی شیلی لەنێوان ڕواڵەتو دیاردەکانـــی سروشتدا دەیان دۆزێتەوە ، لە بناغەدا سروشتی کردنـــی پەیوەنـــدی ئینسانی نێوان ژنو پیاوە ، یان بە مانایەکی‌تـــر ئینسانی کـــردنی پەیوەندیەکانی سروشتە : واتە شیلی خۆی ئەو سیفەتانە ـ سیفەتی مـاچ کردن ـ دەداتە باڵ چیاو شەپۆلو ئاسمانو دەریاکان •• هەر لـــەو کاتیشدا ئەو ڕاستییە دەردەبڕێ کە ئەم پەیوەندیانەی سروشت هیـــچ بایەخێکیان نیە ئەگەر پەیوەندی نێوان ئەوو دڵدارەکەشی وەك ئـــەوان نەبێتە پەیوەندیەکی سروشتی •• خۆ ئەگەر سروشتی کردنی پەیوەندی نێوان ژنو پیاو ، یەکسان‌بێ بە سەلماندنی ئینسانیەتی ئینسان ، ئەوا گرنگ لێرەدا ڕوانینە بۆ ئەو پەیوەندیە وەك پەیوەندیەکی چەشنی ، نـــەك چەندی •• وەك پەیوەندی نێوان دوو مرۆڤ کە هەر دووکیان شـایانی خۆشیو خەمو ئازارنو خاوەنی هیواو ئاواتو نیـــازن •• واتـــە وەك پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیو بڕیاردانی دەوری یەکسانی ژنو پیـاو لـەو پەیوەندیەدا •

گۆران لە بەراوردکردنی جوانی ئافرەت لەگەڵ جوانی سروشتدا ، هەروەکو شیلی ، تای ترازووی پەیوەندیە ئینسانیەکە قورس دەکـــاو ، زیاد لە مەش ، جوانی سروشت دەکاتە ئەنجامێكو پاشکۆیەکی جوانـــی ئافرەت • گۆران ، وەك ( ڕەفیق حیلمی ) دەڵێ : [ هەست بەوە دەکاکە جوانی ئافرەت کانگەی هەموو جوانیەکی تەبیعەتە ، وە بەئیلهامی جوانی ئافرەت هەست بەوە دەکرێ کە لەتەبیعەتا جوانی هەیە ](١٩) • ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان ، گوڵە ئاڵەکانی باخی بەهاران ، شەونمی بریقەداری درەخت ، زەردەپەڕی ئێواران ، پەلکە زێڕینەی پاش باران ، میـــوەی گەیشتووی زەردو سوور :

ئەمانە هەموو جوانن ، شیرینن
ڕۆشنکەرەوەی شەقامی ژینن
بەلام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکییە ، بێ بزەی ئازیز
بێ ئاوازەیە ، دەنگە نەرمەکەی
با نەیدا لەگوێم ، تێر نەلێم ئۆخەی
کام بەرزی جوانە وەك بەرزی بالای ؟
کام تیشك ئەگاتە تیشکی نێو نیگای ؟
کام تاسە ، کام مەیل ، کام چارەنواڕی
تەلیسماوییە ، وەك هی دلداری

گۆران بەراووردی جوانی ئافرەت لەگـــەل روالـەت و دیاردە فیزیکیەکانی سروشتدا دەکاو دەگاتە ئەو ئەنجامەی ئافرەت ئەو سەرچاوە نوورانیەیە کە ڕۆشنایی جوانی و ئاواز بە هەموو سروشت دەبەخشێ .. خۆ ئەگەر بەراوردەکە لەم هۆنراوەیەدا تەنها شتە بـــێ گیانەکان ـ جەمادەکانـی گرتبێتەوە ، ئەوا لە هۆنراوەی ( ڕەوتێکی جوان )دا ئەم بەراوردە دووریەکی بالاترو کاریگەرتر وەردەگرێ .

لێرەدا گۆران ، نموونە زیندووو دلگیرو سەرنج ڕاکێشەکانـــی سروشت وەردەگرێ .. کۆمەلێك گیانلەبەری جوانکیلە ، قازو مراوی و کەو ، کەرویشك و پۆڕو کۆتر ، لە هەلویستی جیا جیای دلگیردا دینێ و لەبەر تیشکی مانگە شەوو خۆرە تاودا ، خۆپیشاندانێکی ڕەنگاو ڕەنگی پڕ لە بزووتنەوەو لەنجەو ئاوازیان پێدەکا .. کەچی هەر ئەوەنـــــدە ترپەی پێی ئافرەتێکی بالا بەرز دێ ، لەعاستی ئەم هەنگاوە کچانیەدا ، گۆران هەموو گیانلەبەرەکانی دیکە فرامۆش دەکاو ، تەنها ئاوازی دەنگی پێی کچەکەیە جێی خۆی لە دلیا دەکاتەوە :

لە ژێر زەردەی خۆرەتاوا
بەناو چیمەنی گوێی ئاوا

چەند بە ئاهەنگ ، چەن سیحراوی
ئەگەڕێ قاز ، یان مراوی
یا کەو لە سەر بەفری نزار
بۆ لوتکەی هەزار بە هەزار
چەند ئیسك سووك ، چەن گورج و گۆل
ئەکشێ پشت لە تۆی تەختی دۆل
یا کەوێشکی تیژ و قەڵەو
لەبەر تریفەی مانگە شەو
چەن جوان ئەڕوا بە قونە قون
سرك و گورج و سپی و خڕین
یا پۆڕ لە گوێی ڕێگای دەشتا
لەگەڵ سایەقەی پاش وەشتا
چەند وردو جوان بە لەنجەولار
ئەشێلێ سەوزە گیای بەهار
یا کۆتری حەوشی مزگەوت ،
چەند خنجیلانەی لێ دێ ڕەوت ،
ئەوەندە جوان ، لەوە جوانتر
لە شنەی بای شەو ڕەوانتر
لە لەرەی پرشنگ ، ئاوازە
لە خوڕەی ئاو ، شیعری تازە
بە ئاهەنگتر ، بە خرۆشتر
بەگوێچکەی دڵ ، دەنگی خۆشتر
پێی ناز ئەنێ بەسەر ئەرزا
جوانێ لە بەژنێکی بەرزا (٢١)

لێرەدا ئافرەت ، وەك مرۆڤ ، وەك جوانیەکی ڕۆحی بێهاوتا ، وەك تاسەو مەیل و چاوەڕوانی و نازو بزەی شیرین ، وەك هەموو ئەو شتانەی لەسروشتدا دەست ناکەون ؟ دەبێتە نموونە یا ئایدیاڵی جوانی •

دیارە ئافرەت ، وەك جوانی ، خۆی لەخۆیدا شایانی ڕێزگرتن و بایەخ پێدانە • بەتایبەتی ئەگەر زانیمان لەنێو هەموو گیانلەبەرانی دیکەی

ئەم گەردونەدا ، نێر لە مێ جوانترە تەنها لە توخمی مرۆڤدا ، بەشێوەیەکی گشتی ، مێ لە نێر ، واتە ژن لە پیاو جوانترە . گۆرانیش کە ( قیلەگای ئایینی جوانی‌یە ) بەو دڵە پڕ لە هیواو گەشبینی‌و شـــادی خوازەیەوە ، لە هەورامانی جوانییدا ، لەنێو کچە باڵا بەرزو چاو ڕەشـــەکانی جافدا ، لە خۆشی جوانی بێ هاوتا شاگەشکە دەبێ‌و ڕەحمەت دەبارێنێ :

**سیا چەمانە ، سیا چەمانە**
**بەهەشتی عەشقە ئەم هەورامانە**
**ئەوەندەی دارو بەردی هەورامان**
**ڕەحمەت لەژنی بەژن‌و باڵاجوان(٢٢)**

هەروەها لە هەڵبەستی ( هەرچەن ) دا دەڵێ :

**لای من چ جامی نەشئە ؛ چە میحرابی دینی عەشـــق ،**
**ئەم چاوو ، ئەو برۆی کچـــە کوردێکی جافییە !(٢٣)**

بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەو ڕاستییەیە کە گـــۆران جـــوانی ئافرەت وەك شتێکی سەربەخۆ ( مجرد ) وەردەگرێ .... کلیلی جۆری پەیوەندیەکەش لە وشەی [ دڵ‌و دڵداریدا ] دەدۆزینەوە :

**کام تاسە ، کام مەیل کام چاوەنواڕی**
**نەلیسماوییە وەك هی دلداری**

یـــان :

**بە ئاهەنگتر ، بە خرۆشتر**
**بە گوێچکەی دل ، دەنگی خۆشتر**

کەواتە پەیوەندیە ئینسانییەکە بە ئافرەتەوە پەیوەنـــدی دڵـــە . گوێچکەی دڵە کـــە ئاوازی دەنگی پێی ئافـــرەت لە گشـــت دەنگ‌و ئاوازێکی دیکەی سروشت خۆشتر دەبیسێ‌و دڵداریشە کە خۆشـــیەك بە مرۆڤ دەدا ، لە هیچ جوانییەکی دیکەی سروشتدا دەستگیر نابێ ....

دڵداری بە مانای کۆکردنەوەی ژنو پیاو لەسەر بناغەی حەز نـــەك خۆشەویستی ••• حەز کردن لە جوانی ئافرەت وەك شتێکی دابڕاو لـــە هەستو نەستو سۆزی ناوەوەی ؟ لە بوونو دەورە کۆمـەڵایەتییەکەی •

گومانی نیە حەز ؟ حەزێکی بێ سنوور ، حەزی جینسی بە ئاشکرایی لەوەسفەکانی گۆراندا بەدی دەکەین ••• تەنانەت لە هەندی هۆنراوەدا کە تاقی‌کردنەوەی دڵداری خـــۆی نیشاندەدەن ، ئەم رووە بە ڕوونی بەدەردەکەوێ • لەهۆنراوەی [ خۆزگەم بەیار ]دا ، گـــۆران دوازدە مانگ بۆ دووری یار دەگری و دەناڵێ ••• بەڵام گریانەکەی زیاتر بـــۆ ئەو دەمو ساتانەیە کەلەگەڵ یاردا بەسەری بردووەو ئێستا لەکیســـی چووەو ئاخی بۆ هەڵدەکێشێ :

هەر ڕۆژە عیشوەیەك ، نازێ
هەر خەلوەتە چەشنە ڕازێ
لەو توانج ، لە من نیازێ
بۆ ماچێ نوقورچێ گازێ
هەر بەزمە دەنگێ ، ئاوازێ
بەچاو بینینێ ، دلخوازێ
بڵێن بەیار بڵێن بەیار ، یاری نازدار
سەد هەزار جار ، خۆزگەم بە یار(٧٤)

لە هۆنراوەی ، بۆ گەورە کچێك ، بۆ خانمێك و ، شـــەوێك لـــە عبداللەدا ، ئەم هەڵوێستە دووبارە دەبێتەوە • حـــەزی ( ئیرۆسی ) لـــە هۆنراوەی ( جلوەی شانۆ )دا ، لە وەسفی زۆر تۆخو خـــەستی لـەشو لاری کچی سەمادا خۆی دەردەخا ••• تەنانەت لەو هۆنراوەیەدا گۆران جوانیو سەماو عیشوەو ناز پڕ بەپێستی ئافرەت دەزانێو ئەویـــش لەڕێگەی ئەو جوانیو عیشوەو نازەوە ، ڕووناکی خۆشی دەرژێنێتە ناو ژینی مرۆڤەوە • ( یان ڕاستتر بڵێین ناو ژینی پیاوەوە ) •

**سەما ، سەمای سنعەت ،**
**حەیاتی جوانی ، جەمالی بزوتنو ، گیانی**
**وجودی عیشوەو ناز**
**لە خواوە بەهرەیەکە پڕ بە پێست بۆ ئافرەت**
**ئەویش بەسەد ئیعجاز**
**ضیای سروە ئەڕژێنێتە ژینی ئینسانی !(٢٥)**

سەیرکردنی جوانی ئافرەت وەك بابەتێکی ڕۆمانسی سەربەخۆ ( مجرد ) وای لە گۆران کردوە ، کە لەم هۆنراوانەدا بیر لەبوونی کۆمەڵایەتیو تەنانەت هەندێ جار ، بوونی ئینسانی ئافرەت ، وەکو مرۆڤێکی خاوەن هەستو سۆزو عاتیفە ، نەکاتەوە .. لە هۆنراوەی شەوێك لە عبداللە دا گۆران زۆر بەئاسایییەوە ، تەنانەت بە خۆشییەکی زۆرەوە ، وەسفێکی ڕەنگاو ڕەنگی ئەو ئافرەتانە دەکا ، کەیەك یەك یان دووان دووان بەسەر مێزی دەوڵەمەندەکاندا دابەش بوونو جوانیو لەشی خۆیانیان پێشکەش دەکەن :

**ئافرەت چرای کۆڕی ئاهەنگ**
**لەنجەی جولان ، مۆسیقای دەنگ**
**لەسەر هەر مێزە یەك دوانێ**
**بۆ چەشنی جوانی نیشانێ**
**یەکێ قژ زەردیەکێ چاوڕەش**
**یەکێ لێو وەك گوڵ غونچەی گەش(٢٦)**

تەنانەت کاتێ لە نیوەشەودا ، مەلهایەکە بەجێدێڵێ ، داخ بۆ ئەوە دەخوا ، خەو ئەوبە هەشتەی لەدەست داوەو هیچ بیر لەهەستو سۆزو ئەو ئافرەتانە ناکاتەوە کە بەم نیوە شەوە هێشتا لە [ نیوەڕۆی ئاهەنگ(٣٦) ]دانو خۆش خۆش بێ ووچان هەڵدەپەڕن ، یان هەڵدەپەڕێنرێن ... نە جیاوازی ئەو هۆیە ئابووریو کۆمەڵایەتییانە دەرك پێ دەکا ، کە کۆمەڵی ئافرەتەکانی لە لایەکەوەو ، کۆمەڵی پیاوەکانی لە لایەکیدیکەوە

گەیاندۆتە ئەوشوێنە . گۆران خۆی هەست بەوە دەکا کە پەیوەندی بە ئافرەتەوە ، پەیوەندی یەکی ( هەستی ـ حسی )یە .... پەیوەندییەکە لەرێگەی حەواسەکانەوە ، ئەو حەواسانەی هەردەم ویستوویانە خۆیان تا ئەو پەڕی لەبۆن‌و بەرامەو خۆشی ژن تێرکەن بۆ یەکا کاتێ دووردەکەوێتەوەو دەستی بەدڵدارەکەی ڕاناگا ، بەناچاری پەنا دەباتە بەر حەواسەکانی‌و یەك یەك بانگەوازێکی گەرمیان لێ‌دەکا کە نەهێڵن لەو دووری‌و غوربەتەدا لەڕەنگ وبۆن‌و لەشی دڵبەرەکەی بێ‌بەش بن ، یەك لە دوای یەك هاواری ـ چاوو گوێ‌و لووت دەکا کە ڕەنگ‌و دەنگ‌و بۆی یارەکەی بۆ بێنن ـ ئەم هاوارە زۆر خەستترو گەرمترو بەهێزتر دەبێ کاتێ دەگاتە سەر حاسەی دەست لێدان ـ لەمس ـ چونکە ئەمیان بەرپرسیاری تەواوی لەزەتەکەیە :

**ئەی لامیسە ! ئەگەرچی نەبوو دەنگ‌و ڕەنگ‌و بۆ**
**وەك شێت بەعەقلێ خامەوە ، خۆم حنستە بەختی تۆ**
**کواتەماسی لەشی نەرمی**
**کوا لەزەتی کۆشی گەرمی**
**کوا مەمکی پڕ چنگ**
**لیمۆی باخی سنگ**
**کوا ماچی لێوی ئاڵ**
**جورعەی ئەبەد خەیاڵ ؟ (٢٧)**

ئێستا گومانمان لەوەدا نی‌یە کە جینس بەشێکی جەوهەری لە هەڵوێستی گۆران بەرامبەر ئافرەت پێك هێناوە ... هەروەك لە سەرەتاوە گوتمان گۆران تەنها لەو کاتانەدا پەنادەباتە بەر خەیاڵ‌و حوببی مەعنەوی کە چارەو دەسەڵاتی زووانی ڕاستەو خۆی نامێنێ ... هەر لەم هۆنراوەیەدا کاتێ هیچ یەکێ لەحەواسەکانی فریای ناکەون ، بە ناچاری دەگەڕێتەوە بۆ خەیاڵ بۆ خاتیراتی عومری ڕابردووی‌و تکای

لێدەکا هەرگیز نووستنی لانەبێ و هەمیشە ، تاوەختی مردن ، وەکو ئاوێنە، وێنەی عەشقی کۆنی یار بنوێنێ • بەڵام ئایا گۆران ، بەڕاستی مرۆڤێکی شەهوانی بووەو ئافرەتی تەنها وەك ( جینس ) سەیر کردووە ؟

ئەگەر وایە ، ئەی ڕوانگەی گۆران بەرامبەر ( جینس ) خۆی چۆن بوە ؟!

مرۆڤی شەهوانی نرخی ئافرەت تەنها وەك لەزەت دەزانێو ، ئافرەت وەك ژەمە خواردنێك سەیردەکا کە تێری لێ خوارد تووڕی هەڵدەداو بیر لە ژەمێکی‌تر یا ئافرەتێکی‌تر دەکاتەوە ••• بە بێ ئەوەی ئافرەتەکە هیچ شوێنێك لە دڵو دەروونو سۆزی ئەودا داگیر کا ••• ئەگەر ئێمە جارێکی‌تر بە وەسفەکانی گۆران ـ دا بچینەوە ، دەبینین گۆران وسفێکی واقیعی جوانی ئافرەتی کردووە[28] ، ئافرەت وەکوهەیە ، لە شێوەو ڕەنگو ڕوخساردا ؟ گۆران بەتەواوەتی ئەو وێنە دۆزەخی‌یەی تووڕ هەڵداوە کە شیعری کلاسیکی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دەربارەی ئافرەتی پێك‌هێنابوو ؟ ئافرەتێك پرچەکانی ڕەشمار بنو چاوو برۆکانی تیرو کەوان بنو پەنجەو نینۆکی لە خوێنی عاشقاندا سوور بووبن •• جگە لەمەش ئێمە لەو وەسفانەدا جوانی رۆحی ئافرەت هەست پێ دەکەین ، ئەو جوانییە ڕۆحییەی ئافرەت لە سروشت باڵاتر دەکا ، ئەو جوانییە رۆحییەی لەتیشکی نیو نیگاو تاسەو مەیلو نازی دڵداریدا ڕەنگ دەداتەوە ••• هەتا لەو نموونانەشدا کە زیاتر رواڵەتی جوانی لەشیان پێوە دیارە ، گۆران دانەبەزیوەتە ئەو ئاستەی وەسفی ( جینسی ) بکا ؟ هەر وەك بۆ نموونە شاعیری بۆرژوازیەتی ، نزار قبانی ، دەیکا[29] •••• وەسفەکانی گۆران لە چوار چێوەی سنووری ڕێزگرتنی جوانی ئافرەتدا ، وەك مرۆڤ ،

نەچوونە دەرەوە ... خۆ ئەگەر گۆران وەك عادەتی زۆربەی شاعیرە ڕۆمانسییەکان ، پەنای نەبردبێتە بەر دادو هاوارو خەون‌و خەیاڵ ، ئەوە ڕوویەکی گەشی واقیعیەتی شیعری ئافرەت لای گۆران نیشـــان دەدا ، واقیعیەت بەمانا سروشتیەکەی نەك بەمانا کۆمەڵایەتییەکەی ... لێرەوە گۆران توانی جەمسەری ڕۆمانسییەت بە واقیعیەت بگەیەنێ‌و ڕۆمانسیەتی واقیعی یا سروشتی بێنێتە کایەوە . ڕاستە گۆران زۆر جار گرنگی بەسۆزو عاتیفەی ناوەوەی ئافرەت نەداوە ، جا چجا دەورە کۆمەڵایەتی‌یەکەی .. بەڵام ئەگەر شیعرەکانی بەشێوەیەکی مەوزووعی شی‌کەینـــەوە ، دەبینین ڕوانگەی گۆران بۆ ئافرەت ڕوانگەیەکی جینسی تەواو نی‌یە ، گـەرچی وەك دەرمان خست ، ئەم لایەنە بە ئاشکرایی لەزۆر هۆنراوەیدا خـــۆی دەنوێنێ ... بەواتەیەکی‌تر ، جینس وەك ـ جینس ـ ، وەك ئامانجێك خۆی لەخۆیدا ، مەبەستی گۆران نی‌یە .... گۆران جوانی پەرســـتەو هەموو شتێکی جوان‌و دڵگیر بام چڵە شەو بۆیەکی خامۆشی ژێـــــر نووترِ کیش بێ، سەرنجی ئەو ڕادەکێشێ.. بەڵام ئەوەی پاڵی پێوەدەنێ وا بە تامەزرۆیی باوەش بە جوانی ئافرەتدا بکا ، هەر پاڵنانە غەریزییەکـــە نیە ، بەڵکو ئەو هیواوئاواتە گەورەیە کە هەر لەمنداڵی‌یەوە لەدڵیا جۆشی خواردووە هیوای بە دەســـت هێنانی ژیانێکی پڕمانا ، ژیانێك هۆشـــی کراوەی ئەو ڕازی‌بکا ئەگەر گۆران ئافرەتی تەنها وەك جینس‌و بەمەبەستی ئارەزووی جینسی سەیر کردبایە ، ئەوا ئافرەت قەت ئەوشوێنە بـــەرزو بەهێزەی لەناو قوڵایی گیان‌و دڵ‌و دەروونیدا داگیر نەدەکـــرد .... ئێمە هەست‌و سۆزی ناوەوەی ئافرەت لە شیعرەکانیدا ، بەدی‌ناکەیـن ، بەڵام عەکس بوونەوەی ئەو هەست‌و سۆزە ، یا جوانـــی ڕۆحی لای

ئافرەت ، لەو تەئسیرە گەورەیەدا بەدی دەکەین کە ئافرەت لە گۆرانی کردووە .

**ژنە کە جیلوەیی حوسنی بە عیشق ئەکا تەعزیز**
**ژنە کە قووەت نەخاتە خەیاڵی ڕەقص ئەنگیز**
**ژنە مووەللیدی عیشقو ژنیشە عەشق نەواز**
**ژنە کە تاری ڕوبابی حەیات ئەکا تەهزیز !**

**سەمایی واسیعی دڵ گەر لە ژن بکەی خاڵی**
**تەجەللیاتی بەدائیع غروب ئەکا ، دەیجور**
**بە سەر سەمایی تەهیدا گوشاد ئەکا باڵی**
**لە کەوکەبی ئەمەلت ون ئەبێ تەبەسسومی نور !**
**ژنە کە گەوهەری سەر تاجی ئیحترامە ژنە**
**بە نوکی نەشتەری ئەلماسی تیژی عیشقو غرام ،**
**خطوطي قدسیەتی حەك کراوی قەلبی منە !**
**بەسیحری خاریقی ژن پڕ قەریحەمە ئیلهام !**
**لە کونجی خاطیرەما تا ژنێکی شۆخ نەکا**
**پەری صیفەت ، بە پەلوپۆی جەمالەوە جلوە ،**
**لەکوێ لە سەهلی زەمینا ، لە سینەیی فەلەکا ،**
**ئەبێتە مەنبەعی شیعرم بەدایعی ئەشیا ؟(٣٠)**

وا بزانم ئەگەر نموونە هەرە بەرزەکانی شیعری جیهانی دەربارەی ژن کۆ بکەینەوە هیچیان لەم هۆنراوەیە زیاتر نرخیان بۆ ژن‌و جوانی ژن دانەناوە ... تاری ڕوبابی ژیان بەدەست ئافرەتەوە دەکەوێتە جووڵە ، عیشق لەئافرەتەوە لەدایك دەبێ‌و هەر ئەویشە باوەشی بۆ دەکاتەوە ... ئەو خەیاڵانەی دەفرن‌و سەما دەکەن هێزی خۆیان لە ئافرەتەوە وەردەگرن ، ئەگەر ئاسمانی دڵ ژنی تێدا نەبێ هەرچی پرشنگی جوانی‌و خۆشی تێدایە ئاوادەبێ‌و تاریکایی باڵی بەسەردا دەکێشێ‌و ئەستێرەی هیوای مرۆڤ بە بێ زەردەخەنەی ڕووناکی دەکەوێتە گۆڕێ ... ئەو گەوهەرەی بەسەر تاجی ڕێزو ئیحترامەوەیە : ژنە .

تەنانەت گۆران لێرەدا دەری دەبڕێ کە سەرچاوەی سەرەکی قەریحەو ئیلهامی ژنەو بەهۆی ئەو جوانییەوە کە ژن دەیڕژێنێتە سەر ڕووی زەوی‌و بۆشایی گەردوون ، هەموو شتەکانی تر جوان دەبن‌و دەبنە چاوگی ئیلهامی شیعری •••• خۆ ئەگەر بە حیسابی متصوفەکان یەکێتی بوون ـ « وحدة الوجود » هەبێ ، ئەوا بەلای گۆرانەوە تەنها پرشنگی جوانی ئافرەتە کە زیندوویەتی‌و جوانی‌و یەکێتی بە بوون دەبەخشێ •

دەوری ئافرەت لەژیانی گۆراندا ، دەگاتە ئاستی دەورێکی سیحری لەهۆنراوەی ( نیاز ) دا گۆران دەگاتە ئەوپەڕی بێهۆمێدی‌و ، دۆش‌دامان‌و دەست‌لەژیان شتن •

**لەشم بێ‌هێز ، گیانم بێزار ، دڵم غەمگین بوو ،**
**هیوام تاریک ، مەیتی عەشقم تابووتی ژین بوو !**
**ناهومێد بووم وام‌ئەزانی دەردێکە کاری**
**بەرەو پیری چون هێناویە دیاری ئێجگاری**
**ئیتر ئەبێ کونجێ بگرم ، دۆش دابمێنم**
**لەسەر مەرگی عومری جوانیم ، یاسین بخوێنم(٣١) •**

بەڵام بە سیحری زەردەخەنەی ئافرەت سەرلەنوێ سەرچاوەی عومری جوانی دەژێتەوەو باخچەی ژیانی پڕ دەبێتەوە لەنەمامی گوڵ •••

ڕاستییەکەی گۆران ، وەك خۆی دەڵێ : دڵێکی بەپەرۆشی بۆ ئافرەت هەیەو زەبوونی دڵە •• ئەو ناتوانێ بۆ لەحزەیەکیش بێ چاو لە جوانی بتروکێنێ جا چ لە سەرەڕێیەکا بە ئافرەتێك گەیشتبێ ، یان قولنچکێکی عەباکەی لاچووبێ‌و لەش ولاری دیبێ ، یاماوەیەکی دوورو درێژ دڵداری بووبێ ، ئەمانە لەڕووی جوانی پەرستییەوە ، هەمان کاری گەورەیان کردۆتە سەر گۆران‌و هەستی هونەرمەندانەیان هاروژاندوە :

تصادفا که جوانیت ، جەمالی بێ وێنەت
بەرامبەری نەزەرم ، ناگەهان تەجەسسوەی کرد
لەبەر ئەوەی بەشەرێکم ، زەبوونی دل هەلبەت
هەقم بوو پەردەی شەرمو حەیام دڕی لام‌برد
بریمە نەخشی جەمالت ، بەبێ حەزەر لە قسمەت
لە هەردوو چاوەوە ، نووکی بلێسەیی سەودا
لە وردترینی دەمارم وەکو پزیسك پژا
تەحەسسوساتی دلێکی پەرۆش بۆ ئافرات(٣٢)

سەردەمی منالێتی گۆران کارێکی گەورەی لە دروست‌کردنی ئـەم دڵە بۆ ئافرەت پەرۆشەدا بووە گۆران وا دەردەکەوێ ، گەرچـی ڕێزی لێ گیراوەو گرنگی بە فێرکردنو پێگەیاندنی دراوە ، بەڵام ئـــەو خۆشەویستیو سۆزە گەرمەی نەدیوە کە منالێك لەناو خێزانەکەیــدا پێویستێتی ... نیزامی عەشیرەتگەری ، تەنانەت لەناو چوارچێـــوەی خێزانیشدا ، لەسەر بناغەی گــەورەو بچوکیو ڕێزگرتنو فرمـــان بەجێگەیاندن ، دامەزراوە ... ئەم حالەتەش ، زۆر جار بۆشاییەکـــی گەورە لە نیوان ئاواتو تەمای کەسێکی هەڵکەوتووی ناو خێزانەکـە ، وەك گۆران ، و ئەندامانی دیکەی خێزانەکە دروست دەکا ... هــەر چۆنێ بێ چ‌خێزانەکەیو چ خەڵکی دەورو بەرەکەی نەیانتوانیوە لـــە گۆران بگەنو مافی خۆی بەپێی ئەو تێگەیشتنە بدەنێ .. بەداخــەوە گۆران هیچ شتێکی دەربارەی ژیانی مندالیو پەیوەندی خۆی بە دایكو باوكو براکانیەوە بۆ بەجێ‌نەهێشتووین تا بیکەینە بەڵگەی ئـەم ڕایەمان ؟ مەگەر ئەو چەند دێڕە نەبێ کە لەسالێ ١٩٢١دا کاتێ لەکەرکـــوك قوتابی‌بووە ، واتە لەتەمەنی ١٦ سالیدا بۆدایکی نووسیوە :

ئەی دایە ! ئەگەر ئەپرسی حالم
نێ ! تۆیش وەکو باقی بێ ڕەحم نیت

**تۆزقاڵێ ، کەیێ رەحم ئەزانیت**
**ڕاسی شەوو ڕۆژ هەر ئەناڵم**

لێرەدا گۆران بە ئاشکرایی دەری دەخا کە تەنها دایکی بـــووە تۆزقاڵێ ڕەحم‌بزانێ ، ئەگینا ئەوانی تر هەموویان بەرامبەر ئەو بێڕەحم بوون • ڕەنگە ئەمە لایەنێکی ئەو پەرۆشییەمان بۆ ڕوون‌کاتەوە •

لایەنێکی تر بەلای منەوە ، دەگەڕێتـــەوە بـــۆ هۆی غەریبیو دوورکەوتنەوە لە ماڵو شارەکەی ، کە زۆر جار لە ژیانیدا تووشـــی هانووە ••• گۆران هەر لەسەرەتای گەنجێتی‌یـــەوە ، تەنانـــەت لە منداڵییەوە ، هۆگری کچان بووەو ، بێ‌گومان ، دڵداریشی لەگەڵـــدا کردوون • بەڵام بەهۆی دوورکەوتنەوە و ئاوارەییەوە ، هەموو جارێك ( خۆشەویستییەکەی ) پچڕاوەو لەداخو حەسرەت بەولاوە هیچی بـــۆ نەماوەتەوە ••• ئەمەش بۆشاییەکی عاتیفی گەورەی لـــە ژیانیـــدا دروست‌کردوە ، کە زۆر بە زەحمەت توانیویێتی ، یان هـــەر نەیتوانیـــوە ، لەتەمەنی لەوەودوایدا پڕی‌بکاتەوە • هەر لەو چەند دێڕەیشدا بـــۆ دایکی ، ئەو هەستە غەریبییەی دەری دەبڕێ ، بەلای منەوە ، زیاتـــر غوربەتی ناوەوەی دەگەیەنێ :

**دەگریم ودەسووتێم هەروەکو مۆم**
**ئاهم ئەگاتە کۆشی گەردوون ،**
**ماتو کزو مەلوولو مەحزوون ،**
**بۆ حالی غەریبو بێکەسی خۆم ! (٣٣)**

دەبێ ئەو ڕاستییەش فەرامۆش نەکەین ، کە گۆران ژنی یەکەمـی لە خۆشەویستی‌یەوە نەهێناوە ••• دوای مردنی باوکی‌و کوژرانی محمد بەگی برای ، دایکی ئەوژنەی بۆهێناوە ، کە خزمی خۆی‌بـــووە ••• لەبەر ئەوە ئەو ژن هێنانە ، ئەگەرچی گۆران بەڕواڵەت بەسەرخـــۆی

بێت بەئاگا بێتەوە
ئەو هەست ئەکا ، بۆ فریشتەی خەو لەچاوانم تۆراوە ،
ئەو هەست ئەکا ، بۆچی شارە زەردەواڵە
لەناو سەرما ووروو ژاوە
ئەو هەست ئەکا زەردەخەنە ، لەو هەرێمە بۆ کۆچی کرد
ئەو هەست ئەکاو دەست ئەخاتە بینی ئەوانەی کەخەویان ،
لە چاوەکانی من تۆران ..
ئەوهەست ئەکاو پەنجەی ڕق ئەکا بەچاوی ئەوانەدا
ڕێبوارەکانی کاروانی دێرینەیان لە خشتەبرد
ئەو هەست ئەکاو
دیسان ئامێز ئەگرێتەوە بۆ پەژارە ،
دیسان ڕێبازی دێرینەی ئەگرێتەوەو
سڵ ناکا لەژووری تەنگی بەندیخانەو
ئەڵقە چەورەکەی سێدارە
ئەو هەست ئەکاو نای داتە دەست ،
ڕۆژگارێکی وەها نووتەك
چارەنووسی چەوساوەکانی ئەو شارە !؟

# گفتوگۆیەك لەگەڵ نووسەری ناسراوی كورد مامۆستا سەعید ناكام

مومتاز حەیدەری

ئامادەی كردووە

شەوی ٥ی مایسی ١٩٧٨ مامۆستا سەعید ناكام بە هۆی نەخۆشی دڵەوە ، بۆ ماوەی (١٥) رۆژ لە نەخۆشخانەی كۆماری هەولێردا خرایە ژێر چاوەدێری دوكتورە پسپۆرەكان ... منیش ئەوەم بە هەڵ زانی هەر چۆنێك بێ گفتوگۆیێكی تایبەتی سەربێی لەگەڵدا بكەم ، بەڵكو پارچەیێك لە لایەنە شاراوەكانی ژیانی مامۆستا ـ كە زۆربەی ژیانی شاراوەیە ـ بپچرم ، جا ئەگەر بۆم بڵاو بكریتەوەو بتوانم بەنەوەی نوێی رابگەیێنم ، دەبێتە هۆی شادیو دڵخۆشیم ، چونكە دەمێكە بەو ئاواتەوە بووم كە لە گەڵ مامۆستا ناكامدا لە چاوپێكەوتنێكی تایبەتیدا ، هەندێ لە یادداشتەكانی تۆمار بكەم ، بەڵام رازی نەدەبوو ... تا كاتی بەسترانەوەی بە دەزگای ( ئی . سی ، جی )ی نەخۆشخانەی هەولێر ، ئەم دەرگا بچكۆلانەم بۆ كرایەوە ، ئەمە لە لایەك ، لە لایەكی تریشەوە، هەر چەند مامۆستا ناكام خۆی نووسەرێكی رۆژنامەی عیراقەو لە نووسینگەی رۆژنامەكەدا هاوكارین ، لەوانەیە ئەم گفتو گۆیە كردارێكی ئاسایی رۆژنامەگەری نەبێ = بەڵام مانەوەی لە نەخۆشخانەدا بۆ چەند رۆژێك هیچ دوو دڵی بۆ نەهێشتمەوەو نەمتوانی ئەم دەرفەتە بچكۆلانەیە لە كیسی خۆم بدەم . لام وایە ئەم گفتو گۆیە سەرەتایێكی باشە بۆ تۆمار كردنی تافی كردنەوەو رازو گلەییو دەرخستنی سامانێكی شاراوەی

ڕۆشنبیریتی کورد لە دو توێی ژیانی مامۆستادا •

ئەوی ڕاست بێ لە سەرتاپای ژیان‌و ڕەوتی تاقی‌کردنەوەی ڕۆشنبیریتی‌و هەڵوێستی سیاسی‌و نەتەوەیی‌و کورد پەروەری مامۆستا ناکامدا ، زۆر شتی شاراوەی گرنگ پەنگی خوار دۆتەوە کە تا ئێستا ئەو دەرفەتە پێویستە نەرەخساوە بۆ تۆمار کردنیان ، جا چ لە لایەن خۆیەوە وەك یادداشتێکی تایبەتی نووسرابێتەوەو چ لە لایەن دەزگاکانی ڕۆژنامە ـ گەری‌ی کوردی لێ‌ی کۆڵرابێتەوە •

لە بەرکوڵی ئەو پرۆژە فراوانە ، واتا تۆمار کردنی یادداشتەکانی مامۆستا ناکام ، ئەم گفتوگۆ سەرپێ‌ییە پێشکەشی خوێندەواران دەکەم‌و هیوادارم جارێکی تر بە دوورو درێژی پێك بگەینەوە ••

**۱۱ ـ ٥ ـ ۱۹۷۸**

**دەقی پرسیارەکانم :**

**پ۱ : بیستمان ڕۆژی ۲۲ـ٤ـ۱۹۷۸ بە بۆنەی یادی هەشتا ساڵەی ڕۆژنامە گەری‌ی کوردی‌یەوە ، لە مەڵبەندی یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد لقی سلەیمانیدا کۆڕت پێکهێناوەو بۆ دانیشتوانی ئەوێ دواوی ، بەلام هیچ دەنگوباسێکی ئەو کۆڕە لە چاپەمەنی‌یەکاندا نەنووسرا ••! جانکایە ئەگەر دەکرێ ـ هەرچەندە نەخۆشیشن ـ باسی چۆنێتی کۆڕەکەو هۆی ئەم بێدەنگی‌یەمان پێ بلێ ••؟**

**پ۲ : وازانراوە کە تۆ یەکێکی لەنووسەرە ناسراوەکانی کورد ، بەلام نە هیچ بەرهەمێکی چاپکراوتمان دیوەو نەنووسینت لە چاپەمەنی ئەمرۆماندا دەبینین ••؟! دەستەی لاوە ڕۆشنبیرەکانی ئەمرۆ یا هەر هیچت لێ نازانن یا زۆر کەمیان لێ‌بیستووی ، هۆی ئەمە چی‌یە ••؟!**

ب٣ : ئەمرۆ دەرفەت هەیەو دەرگا لـە سەرپشتە هـەر کـەسی نووسەر بێت‌و شتێکی لە بارابێت لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامـەکان نووسین بڵاو بکانەوەو لە پرۆگرامەکانی رادیۆی کوردیدا بەشـداری بکا ، کە چی تۆ ناوت نی‌یە ، ئایا بەرهەڵستیکت لە ڕێدایە ، یاخـود وات پێ باشە ؟!

**ئەمەش دەقی وەڵامەکانی مامۆستا ( ناکام )ە :**

وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی کاك مومتاز حەیدەری لە نەخۆشخانەی هەولێر لێ‌ی کردم •

**وەڵامی پرسیاری یەکەم :**

بەستنی کۆڕەکەم لە سلەیمانی‌و بە نەخۆشی چونم بۆ ئەوێ تەنیـا لەبەر ئەوە بو کە زور ترینی لاوەکان‌و خوێندکارانی زانکۆی ئـەوێ بێن‌و ببیسن‌و ئەگەر پرسیاریکیان بو ، بتوانم بـەرەو ڕو وەڵامیـان بدەمەوە • بەڵام بەداخەوە چەند قۆرتێك کە بیری لێ نەکرا بۆوە بونـە هۆی سەرنەگرتنی مەبەستەکەم‌و هەرچەندە ریسەکەم نەبۆوە بە خوری بەڵام باشیش نەرێسرا : ئێوارەی ڕۆژی ٢٠-٤-٩٧٨ کـە من گەیشتمە سلەیمانی‌و سەری بارەگای یەکێتیم‌دا ، تازە بیریان کەوتبۆوە کە شتێکی وایان بەدەستەوەیە ، بۆ یە هەر لەوێ سێ پارچە کارتۆنی ٣٠ × ٤٠سم‌یان هێناو لێ‌یان نوسین « ڕۆژی شەمو سەعات ٤ کۆڕێکمان هـەیە بۆ یادی حەفتا ( !! ) ساڵەی ڕۆژنامـەگەری‌ی کوردی » کێ تاقەتی گوێگرتنی هەیە ، بابێ « ویستیان ئەم ئاگاداری‌یانە لە بەردەم کتێبخانەکاندا هەڵواسن بەڵام دەرکەوت کە بەیانی هەینی‌یەو زوربەی کتێبخانەکان دادەخرێن •

ڕۆژی هەینی ٤/٢١ کە بەناو شارا گـەرام‌و هـەندێ برادەری

نوسەرو ئەدەبدۆستی خۆمم چاو پێکەوت ، دیاربو کەسیان هەواڵی ئـــەو کۆڕەیان نەبیستوە .

ڕۆژی ٢٢-٤-٩٧٨ گەواڵە هەورێك بەری ئاسمانی گرت ، جارێ سفتو تاوێ تەنك لێڵو رونی دەکردو لە پریکا رێژنەیێکی بەهـــاری دادەپرزاند ، بۆ نزیکی ســـەعات چـــوار کـــە کاتی دەســـت پێکردنی کۆڕەکەیە ، هەورە رەشەکان رەویبونەوە بەڵام تاکو تەرا پارچـــەی خەستو بۆر هێشتا مابوونو بە ئاسپایی پیاسەیان دەکرد ، هەر لـــەو کاتەشدا هەندێ لەو ڕۆڵە کوردانەی خـــۆیان بۆ تەڕبوونو گوێگرتن ئامادە کردبو ، دو دوو سێ سێ دەرکەوتن . رێکخستنو کار پێکـردنی میکرۆفۆنی پەكکەوتوش ماوەیێکی خایاند .

خـــەڵکەکە دانیشتبونو چاوەروان بون بزانن چ شـــەکرێکیان بۆ دەشکێنرێ کە برادەرانی کارگێڕی یـــەکێتی بەگـــوێیاندا چرپاندم پێویستە چەند بابەتێکی گوتارەکەم بخەمە پشت گوێ یا بیانکەم بـــە ژێـــر لێوەوە ، چارم نەبو ، ( بان چاو )ێکم گوتو چومە سەر ئەو کورسییەی بۆم دیاری کرابوو دەستم پێکرد .

ئا بەم چەشنەو لەو بارەدا دەستم بە خوێندنەوەی ئەو گوتارە کرد کە بە ناوی ( بیرەوەریی چل ساڵەی رۆژنامە نوسیم ) بو باسی مەینەتیو قەلفری خۆمو وشە خنکاوەکانی کـــوردیو شوێن پێ کەوتنی ریچکە شکێنە نەمرەکانی رۆژنامەنووسی کوردی ئەملاو ئەولام تێدا کردبو ..
هێشتا لە ناوەراستی باسەکەمدا بوم باران دایکرد ، هەتادەمرم هەمـــتو کوردایەتیی ئەو لاوە خوێن گەرمانەم لە بیر ناچی کە رێژنەی گەواڵەی بەهاری قژی شانەکراوو پانتۆڵە وتودراوەکانیانی دەشەمزاند ، کـــەچی بانگیان دەکرد « .... ئەگەر دەتوانی جارێ ئەم برگەیەمان بۆ تەواوکە ،

جا دەچینە ژوورەوە • ، بەڵێ هەر کەسە کورسی خۆمانمان هەڵگرت‌و لە ناو دالان‌و ژورێکی بچوکدا بەسەریەکا ترشاین ، تا لێ‌بومەوە •

ئەمە وەمی ئەو پرسیارەت کە بۆچی‌و چۆن ئەو کۆڕەم لە سلەیمانی بەست • بەلام هۆی ئەوەی ئەم رەنج‌و گوتارەی من دەنگی نەدایەوەو نە لە پێشیاو نە لە دوایدا باسی نەکرا ، پێویستە ئەوەمان لە بیر نەچێ کەیەکێتی لقی سلەیمانی کارامەیی‌و شارەزایی‌یێکی تەواوی لە پێکهێنان‌و رازاندنەوەو خەملاندنی کۆرەکانی خۆیدا هەیە ، هەر شتێکیان بۆ بچێ ، لیژنەی رۆشنبیری هەڵیدەسەنگێنێ‌و هەقی خۆی دەداتێ ، ئەوان باشتر دەزانن کامە کۆڕ هەڵدەگرێ ماوەیێك پێش دەست پێکردنی چاووڕاوی بۆ بکرێ‌و لە پاشتریشدا پوختەی ناوەرۆکی بە کوردی‌و بەعەرەبی بۆ گۆوارو رۆژنامەکان بنێردرێ تا خوێنەران لێی بکۆڵنەوە ، هی‌واشیان بۆ دێ شیاوی ئەوەیە بەبێ سێ‌و دو فرێ بدرێتە تەنەکەی ژێر مێزەکەیانەوە •

وا دیارە شتەکەی من لەبابەتی دووەم بوەو لەبەر خاتری پیری‌و ناسیاویم لە ڕوو داماون‌و ئەم قیروسیایەیان کردوە • منیش بەیارمەتی لیژنەی رۆشنبیری‌و داوای لێبوردنیان دەلێم هەر چەندە هیچ لارێم لە رایەکەیان نی‌یە ، بەلام گوایا ژوشك گوتویەتی : « لە دنیادا بێچوی کەس لە بێچولەی من نەرم‌و نۆڵتر نی‌یە ! » بۆیە بە هەر بارێکا بۆم بلوێ بە تەمام ئەم نوسراوە هەلەق مەلەقەی خۆم بە شێوەیێك لەچاپ بدەم‌و بلاوی بکەمەوە •

## وەلامی پرسیاری دومم :

ئەمە راستە کە من زۆر لە مێژە دەستم داوەتە قەڵەم‌و بە ناوی نوسەرو رۆژنامە نوسەوە قاقەز رەش دەکەمەوە ، بەلام تازە لەوە تێپەڕیوم بە

شوێن کلێشەی ناوی خۆمدا بگـەڕێم لە نلو گۆوارو ڕۆژنامەکانـدا ، نوسراوی بە کەڵك‌و رازاوەو سود بەخش هی خۆم بێ یا هی هـەر نوسەرێك بێ وەکو یەك دڵم شاد دەکاو نەشـەم دەبزوێنێ ، ئەو بابەتەی حەزی لێدەکەم پێم خۆشە نوسەرێك بە شێوەی تایبەتی خۆی لێی بدوێ‌و من بیمە خوێنەری ، هـەندێ جار گوشـراوی بـیری خۆم بـە نـاوی (وەرگێڕراو) یا (لاسایی) ئەدەبی بێگانە لە قەڵەم داوە ، چونکو ئاواتی من بڵاوبونەوەی بیرو ئەندێشەکەیە نەك ناوی دامێنی گوتار •

تەمەنی درێژی ڕۆژنامە نوسیم پێی سەلماندوم کە دەست بە کلاوەوە گرتن‌و پشتەو با رویشتن ، ئەگەر شانازیش نەبێ سەر سەلامـەتی‌یە ، کەچی هەر فێر نابم ، ئەوەبو ساڵی ٩٦٢ سەر گوتارێکم بۆ ژمارە (٣٧)ی گۆواری هیوا نوسی لە ژێر ناوی « هەر ئەبێ بنوسین »دا ، ئەو گوتارە بو یەهۆی بڵاو نەبونەوەی گۆوار بە تـەواوی‌و لەناو چـونی زوربـەی ژمارەکانی‌و گەلێك چەرمەسەرێ بۆ خۆم ، کـە چی ئێستاش ناوەرۆکی ئەو وتارەنۆرینەم لە زوربەی نوسراوە بێ قرەکانی خۆم پێ بە تامترە •

بۆ ئەوەی شتەکەت پتر بۆ رون بێتەوە دەڵێم من قەلەمەکەی خۆمم قنـج داچەقاندوە ، هەر کاتێ بمەوێ ملی خۆم لە رادەیێکی دیارکراو زیاتـر شۆڕکەمەوە ، نوکەکەی لە چاوم هـەڵدەچەقێ‌و ناچارم دەکا سـەرم هێت‌کەمەوە • من نوسینی زۆرم هەیە کە کەمیـان لێ چاپکراوەو زۆریان ماون ، دڵم تەنیا بەوە خۆشە ئەگـەر بێتو نوسینی ٣٠ـ٤٠ سـاڵ پێش ئەمڕۆم و هی‌ئێستاکەم یەك بگرێت‌و جگە لە شێوەی نوسین کـە گۆڕانی بەسەر داهاتوە ناوەڕۆکیان بکرێتە بەرگالی بەرزو نزم بونەوەی ناو چەوانم، جیاوازی‌یێکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نابیندرێ •

هەر وەرزە جۆرە کالآیێك پێویستی رۆژانەیەتی • مەکینەی سەهۆڵ زستانان دەخەوێو سوبەی ئاگر هاوینان بێقەدرە ، ئەوکەسە وریاو ئازایە لە لێدانی ( پیك )و ( مایێك )دا وەستابێ •

یەکێك لەو لاوانەی گوایا شیعر دەنوسێو من نەمدیوەو نایناسم ، گوتویەتی : « فلانکەس ـ واتا من ـ نوسەری سەردەمێکی تایبەتی بوەو ئەمرۆ باوی نوسینی نەماوەو بەسەرچوە ! » قسەی ئەو کاکەیە راستە ، بەڵام بەو مانایە تا کە ئەو مەبەستی بوە ، باو نەمانەکەم رۆژنەمانەکەمە ، ئەو کاکەیە نازانێ من چەند تاسەدارو ئارەزو باری ئەوەم قەڵەم بگرم بەدەستەوەو چی لە دڵدایە بۆ رۆڵە لاوەکانمی دەرببرم ، ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ، بیڵێم • ئەم نەتوانینو نەزانینەم تازە نیە ، لە چلەکاندا دەمویست هەندێ شت بنوسم نەیانهێشت ، لە پەنجاکاندا بابەتی نوسین زۆر بون دەیاندڕینو لە سەر دڵما دەبونە گرێ ، لە ساڵەکانی شەستا بابەتی نوسینو دەربڕین بەجارێ لەدەرونمدا کەڵەکەی کردو بەتۆپەوانەی ( ئاشێ ) بەری گیراو تائێستاش هەروا ماوەتەوە • دەڵێن پەنمانو ئاوسان تەقینەوەی لەدوایە ، ئەگەر پزیشکەکان باشی بۆ چوبنو لولەکانی دڵم بەلخیان گرتبێ ، لە جێی خۆیدایەو دەبوایە لە دەمێکەوە ئەم بڵقە بتەقایە • ئەوەی لێیاندەوێم نەیزانمو ئەوەی دەیڵێم نەشێ ، دیارە دەبمە ئامێرێکی ژەنگن ، ئەو کەسانەی دەیان ناسیم لە بیریان دەچمەوەو ئەوانەی نەشیان دیوم ناوەکەشمیان بەلاوە سەیرە ! جگە لەو هۆ سەرەکی‌یانەی باسم کردن هۆیێکی لا بەلاش هەیە پاڵی بەربونم پێوە دەنێ کە بریتی‌یە لە هەڵپەی ئەوانەی رێبازی نوسینو بیرکردنەوەم پێچەوانەیانە ، ئەوانیش بە سانایی هەلیان دەست کەوتوە •

## وەلامی پرسیاری سێیەم :

کاکە مومتاز ، لە وەڵامی ئەم پرسیارەتا گوێ بگرە با سەرگورشتەیێکی کوردەواریت بۆ بگێڕمەوە : دەڵێن دو ئەستێرەناس لە شارێکدا دەژیان کە زوربەی پێشگوتنەکانیان لە مەڕ مانگ گیران‌و باران‌و سەرماو گەرما راست دەردەچو ، بۆیە خەڵك زۆر رێزیان لێدەنان •

رۆژێك ئەو دو زانایە بە دانیشتوانی شاریان راگەیاند کە بەم زوانە بارانێك دەبارێ هەر کەس لێی بخواتەوە شێت دەبێ ، خەڵك سەرەرای هەمو بڕواو رێزیان ئەم قسەیەیان نەچوە مێشکەوەو بەراستیان وەرنەگرت ، ئەستێرەناسەکانیش هەر چەندی کوپەو گۆزەو سەتڵ‌و مەنجەڵیان بو پڕ ئاویان کردو بە چاوەروانی بارانی نەگریس دانیشتن • بارانەکە باری‌و چەند رۆژێك بێ وچان رەهێڵەی هەڵ نەبڕونگاند • خەڵکی شار کەوردو درشتیان لەو ئاوەیان خواردبۆوە کەس هەستی بە گۆڕانێك نە دەکرد ، ئەوەندە نەبێ کە هەڵس‌و کەوتی دوئەستێرە ناسەکەیان نا ئاسایی دەهاتە بەر چاوو خەفەتیان بۆ دەخواردن ، بەلای هەرکەسا برۆیشتنایە یا پێیان پێدەکەنین یاسەری بەزەییان بۆ دەلەقاندن • پاشا ئەو دوانەش چاریان نەما ، بڕیاریاندا یا لە ئاوی بارانەکە بخۆنەوە بێنە ریزی خەلك ، یا سەری خۆیان هەڵگرن‌و بچنە ولاتێ کەس نەیان ناسێ •

کوردی نوسین بە شێوەی ئەمرۆ بۆ پیرە مێردێکی وەکو من کە لەگەڵ بیرێکی کلاسیکی‌و دارشتنێکی تایبەتیدا راهاتوم‌و خوم پێوە گرتوە ، لەمڕۆژەدا پەسند نی‌یەو جێی خۆی ناکاتەوە ، ئەو هێزو پێزەشم نەماوە

بتوانم یەکسەر لە ( چەپێ )و ( سێ‌پێ‌یی ) یەوە بیگۆڕمە سەر ( چا چا )و ( رۆك ئەندرۆل ) • جا چۆن من خۆم لە مەیدانی وەشاندنی ئەمڕۆدا بە ئاوەکی‌و بێ‌برەو دەزانم ، گومانم نی‌یە کە چاپەمەنی‌و بەرنامەکانیش بە هەمان چاو دەڕواننە نوسینەکانی من ••• بۆیە نەماندو بونی نوسینی کرپیار دەدەمە بەرخۆم‌و نەرەنجی ( ببورە )و ( بەداخەوە ) دەخەمە بەر ئەو کاربەدەستانە •

ئەم قسەیە لە خۆمەوە ناکەم ، چەند جارێك تەقەلام داوە شتێ بنوسم بلاوبکرێتەوەو سەرنەکەوتوم ، بۆیە خۆم مات کردوەو لە لوتکەی سەرسوڕمانەوە بەم دنیایەدا هەلدەڕوانم •

# ئەی ئەستێرەکان

فرووغی فەرڕوخزاد
نەژاد عزیز سوێمیٚ
لەفارسی‌یەوە کردوویە
بە کوردی

ئەی ئەستێرەکان کە لە بەرزی ئاسماندا
بە نیگای خۆتانەوە چاو بڕ دانیشتوون ..
ئەی ئەستێرەکانی پشت هەور ،
کە بە دیار دونیای ئێمەوە دانیشتوون ..
ئا ، ئەوە منم کە لە دڵی بێ دەنگی شەوا
نامەی دڵداری ئەدڕێنم ..
ئەستێرەکان گەر دەهاتام بێن
لەخەمی ئەو کۆشم بڕ ئەستێرە دەکەم

★

بە دڵێ کە بۆنی وەفای نەکردوە
جەورو ستەمی بێ کۆتایی‌و بەهانە خۆشترە !
عیشوەو نازی زیرەکانە
لەتەك ئەو هاوڕێ خۆپەسندانە خۆشترە !

ئەی ئەستێرەکان چی بوو کە لە نیگای‌مندا
ئەو خوێن گەرمی‌و گۆرانی‌و ئاوازە مرد ؟
ئاخر چی‌بوو ئەستێرەکان لە لێوەکانی ئەودا
ئەو ئاخە گەرمانەی دڵداری مرد ؟

جامی بادەم سەرنگون‌و پێخەفم بەتاڵ

سەرم بە ڕووی نامەکانی ئەو کردوە ..
سەرم پێ کردوە ، لە نێوان ئەو دێرانەدا
بۆ شوێنەواری وەفای ئەو بگەڕێم ..

★

ئەی ئەستێرەکان مەگەر ئێوەش
لە دوو ڕوویی و جەفای دانیشتووانی خاك ئاگادارن
کە بەم جەشنە لە دڵی ئاسمانیدا ،
ئەستێرەکان ، ئەستێرەکانی گەش و پاك ؟

★

من کە ئەوەی هەیەو نیەم دایە بەرشەق
تا کامی ئەو لە عیشقی خۆمدا حەڵاڵ کەم ..
لەعنەتی خودا لە من بێت ئەگەر بێجگە لە جەفا
لەوە زیاتر وەفام بۆ عاشقان هەبێت !!

ئەستێرەکان ئێوە دڵۆپی فرمێسك ئاما
سەرتان ناوەتە دامێنی ڕەشی شەوەوە
ئەی ئەو ئەستێرانەی کە لە جیهانی نەمریدا
کلاورۆژنەیەکتان کردۆتە ئەم جیهانە ..
ڕۆیشت و خۆشەویستیشی لە دڵما هەر ناڕوا
ئەستێرەکان ئاخۆ چی بوو منی نەویست
ئەی ئەستێران ، ئەستێرەکان ، ئەستێرەکان ؟
ماڵی ئاوای وێران نەبووی دڵدارە نەمرەکان لەکوێوەیە

---

* ئەم شیعرەی فروغ لە لاپەرە (٣٦)ی کتێبی « برگزیدە اشعار فروغ فرخزاد»دا بلاوکراوەتەوە بەناوی ( ای ستارها )وە .
* وەرگێڕ *

# تــارمــایــی

## ڕابندرانات تاگوور

**ئەحمەد عەزیز عەلی**
**کردوویە بە کوردی**

دوا ڕۆژی پیرەمێرد نزیك بۆوە ... دێیەکە هەموو کەوتنــە شیوەن و قوڕپێوان . هاوار ئەکەن ئەڵێن : چۆن لــەدوای تۆ ئێمە ئەژین ئەی پێشەوا ؟ چۆن بێ تۆ هەڵئەکەین ئەی پێشەوا ؟ تاکە ڕابەرو تاکــە پێشڕەومان هەر تۆی ئەی پێشەوا !

پیرەمێردی نەخۆش و پەشۆکاوو گەمارۆدراو ســـەرنج ئەدات و ئەڵێ : داخم ناچێ کێ لەدوای من سەرپەرشتیی ئەمانە ئەکـــات ؟ کێ لە پاش من سەر کردەیان ئەبێ ؟ کێ لەپاش من لە بەڵاو نەگبەتــی ئەیانپارێزێت ؟ زەردەخەنەیەکی شانازی و شکۆداری دەم و چاوی ڕوون ئەکاتەوە .

نزای نوێژکەران و نۆکەرانی دڵســـۆز لای یەزدانـــی میهرەبان و بەبەزەیی گیرابوو .. لەپاش کۆچی بێوادەی پیرەمێرد ، تارماییەکــی ئەوی هێشتەوە . لادێییەکان بەم تارماییە ئاســـــوودە بوونەوە ! دەستەو کڕنووش بەرانیش دەست بەدوعاوە هەموو ڕۆژێ بـــــەگوێی خەڵك و خواکەدا ئەیانچرپاند : ڕۆژانی ڕابوردوو جارێکی کە دێتەوە ! پیرە مێردیش بەم زوانە هەر ئەگەڕێتەوە !

تۆ کە بیر لە پاشەڕۆژ ئەکەیتەوە تووشی مەراق و سەر ئێشەیەکــی بێ ئەندازە ئەبیت . کە ڕابووردوو ئەهێنیتەوە بەر چاوی خۆت ، لــە هەموو مەراقێك سەرفەراز ئەبیت . چــونکی ئەتوانی هـــەمــوو گوناو

سووچێ بخەیتە ئۆباڵی ڕابـــوردوو ، تەنانەت ئـــەو ڕابووردووەش تارمایی بۆ خستووینەوە •

زۆر کەس هەن ڕابوردوویان کردووەتە ڕابەری خۆیان ، لـەو ئەشکەوتە پڕ لەدەعباو ڕەهزەنە نایانەوێ بێنـــە دەرێ • ئەمیش وەك خێوێ سواری بۆقەتەی ملیان بووە • ئەوانە ڕزگار بوونیان زەحمەتە !

پیاوانی ئەم دێیە بە چاوی بەستراوەوەو بەعەقڵی ناکامـــەوە بوونەتە دیلی تارمایی پیرە مێردی کۆچ کردوو • پیرەمێرد دەمێکـــە کۆچی کردووە ، کەچی تارمایی‌یـەکەی هێشـــتا زۆرکاریگـــەرە • بەردەبارەکان ئەڵێن : ئەم جۆرە ژیانە ڕەوشـــتی نەتەوەی چاکانـــە لە کامەرانیدا •• « ئەمیا » کە دەعبایەکی کوێرە لە بنیاتی ژیانیـــەوە تـا ئیستا وەك خۆی ماوەتەوە • درەختیش هەزاران ساڵ لەمەوپێش چـۆن بوون وانە • هیچ ! دەروێشانی تارمایی کە ئەمەیـــان بیست زۆر پێی خۆشحاڵ بوون ، چونکی خۆشیان وەك ئەوان لەسەر ڕەفتاری کۆنـــی باوكو باپیریان ماونەتەوە ، هیچ نەگۆڕاون •

وڵاتی تارمایی بە چوار دیواری سەخت شوورە کێشراوە • ئـــەو دیوارانە بە چاو نابینرێن • کـــەسیش ناتوانێ لێیانـــەوە دەرباز بێت : تارمایی خۆی لێرە نی‌یە ، خوای لێرەیـــە • گشـــت نیشتمانـــە شاخاوی‌یەکەی کردووە بە قوڵو بە سوڵتان بۆ خۆی ، وەك پێوە ندێـك چۆتە پێی پیاوەکانیەوە ، وەك تەوقێ لە گەردنی نەئـــەوە ئـــاڵاوە ، دەستی بەسەر گیانی ڕزگاری‌و سەربەستیدا زاڵە • لە مەترسیی ئـــەو هەموو مات‌و خامۆشن • ئەگەرچی وڵاتی تارمایی خاوەن کانی زیـــوو ئالتوونی رەشە ، بەڵام کەم خۆراك و بێ بەرگە ، هێزو تەندروســـتی تیا نی‌یە • زنجیری نەریتی ئەم وڵاتە بووەتە بۆنەی دژواری‌و ســـتەم

بۆیان • حوکمی تارمایی لە هیچ ولاتێکی‌تردا نەحەویوەتەوە • بۆیە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنیان هەر خولاوەتەوە • لە ناویانا تاقێ نەبوە تنۆکێ خوێنی خۆی لە پێناوی کۆنەپەرستیدا ڕژاندبێت • هەمیشە بەتەقەلاو مەردایەتی ژیانێکی سەربەست و ئازادیان بۆ خۆیان هێناوەتە بەرهەم •

ئەلحەد بەدەست و بەر دەبارەکان پاش ڕاوێژ کردنی نامە کۆنەکانیان بڕیاریان دا نە سەرزەنشتی خۆیان بکەن نە هیی‌تارمایی • هەموو گوناهێکیان خستە ئۆبالی ئەژواری بە تەنیا ، وتیان ڕەوا نی‌یە ئەژواری ئەوەندە زوو زوو سەرمان لێ بداتەوە • پیاوەکان ئەمەیان وت و پێی ئاسوودە بوونەوە •

کەواتە گوناهباری لە کێ‌وەیە ؟ نی‌یە بتوانێ بەربەستی ئەژواری بکات هاتو پەیتا پەیتا دەستی کرد بەهێرش •••

زۆر لەمێژ نی‌یە بێگانە لەدوورەوە لە پشت دەریاوە هوروژمی هێناوەتە سەر ولاتەکەمان : وەك کوللەی برسی بەسەرمانا داباری : سەوزایی و شیناییمان سووتاو پاکژ درا • زەوی و زار ڕووت و قووت بەجێ هێلرا ، سەرچاوەکان بە خۆلەمیش وشك هەلگەڕان ، گومان لەوەدا نی‌یە ئەو بێگانانە زۆر بەچەنگ بوون • دووربین و چوست و چالاك بوون • دەروێشانی تارمایی هیچ گوێیان نەدایە ، هۆشیشیان لای فرمانی خۆیان نەبوو ، دوورە پەرێز وەستان ، خۆیان لەکێشمەکێش لادا ، باوەڕیان وابوو : « خوا کەریمە ، ڕۆژێ پیرە مێردە کۆچ کردووەکە هەر ئەگەڕێتەوە ! » •

پەردەبارەکان بە باوەڕنامەی سالێ خواردووی خۆیانا چوونەوە « خۆشنوود ئەوانەن خولیای مالی دنیاو ئارایشتیان لەدلدا نی‌یە » •••

پیاوەکان ئەمانەیان زانی گەلێ دڵشاد بوون ••• ئەمەش هیچ دەرمانێکی ئەو ئەژواری یەی نەکرد • هەر دەردەسەری یان بۆ مایەوە ••• چۆن موڵکانە بدەن • هێشتا هیچ لە زەوی هەڵنەگیراوە ؟ زەویی چی ؟ هەمووی خاشاک و خۆڵی سووتاوە !

دەنگی پێکەنینی مردووەکان لە سەرقەبرانەوە بایەک بەگێژ هێنای :

موڵکانە لە گیانی خۆتان !

لە شەرەفتان ••!

لە خوێنی جگەرتان بدەن !••

ئەژواری ڕووی کردە هەر وڵاتێ ، ئیتر هەر دوا بەدوایا دێت !

پرسیارێک لە پڕ بەرز بووەوە :

ئایا حوکمی تارمایی تاکەی ئەمێنێت ؟

بەم پرسیارە گشت نێرو مێو پیرو کۆماوە ترسیان لێ نیشت • وتیان : بەبیرەوەریی ئێمە ئەمە نەبیستراوە ئەمە واتەی چی یە ؟••• « گۆڕان شایانی ژیری نی یە ! » بەڵام لاوی خوێن گەرمو شۆڕش خواز هەر لە تەلاشدا بوون !

لە سەرەتادا ئاسوودەو هێمن بوون •• بەرە بەرە گوستاغی و ڕووهەڵماڵراوی یان زیاتر بوو • ئەیانویست بە هەچ کلۆجێ بێت لەتارمایی ڕزگاربن ، دەستەو بەرەی تارمایی گاڵتەیان پێ دەکردن ، بەتەوسەوە ئەیانوت :

ئازان خۆتان تاقیی بکەنەوە • بزانن ئەتوانن ئەم چوار دیوارە نهێنی یە بڕووخێنن ؟

ڕاستت ئەوێ پێشین هەمووی نە تەواو مردووە ، نە تەواو زیندووشە • تەواو وەك خێوێ وایە ، هیچ کەڵکێ نابەخشێ بە میللەت ، یارمەتیی نادا بۆ پێشکەوتن‌و سەرفەرازی •

دوو پیاو لەترسی بەرپابوونی شۆڕشی لاوان بەدرێژایی ڕۆژگار بێ دەنگ‌مانەوە ، ورتەیان لەدەم‌نەهاتە دەرەوە • پاشان کەوتنە مەراق • شەوێ لەشەوان هەستان چوون تارماییی‌یان دۆزییەوە • یەکێکیان پێی‌وت :

ئەرێ وەختی کوچت نەهاتووە ؟

تارمایی لە وەڵامدا وتی :

ئەی بەستەزمان ! من لەودیو کەنارو دەریاوە بە یارمەتیی دۆستان‌و هەواخوایان هەر کە نزیکی مەرگ ئەبمەوە ئەمژیێننەوە •• چۆن بەجێتان ئەهێڵم تا خواستم لێ نەکەن ؟

پیاوێکیان بەدەم لەرزەوە وتی : زۆر لەلای ئێمە لە کۆچی تۆ ترساون !

تارمایی لەوەڵامدا وتی :

ئەوترسەی حوکمی من بەسەر ئێوەوە هەر بەرپایانە !

---

بەردەبار : حەکیم •

ئەژواری : مشاکل •

خوشنوود : پیرۆز •

# خانووی ژماره (٨)

**کورتـــه چـــیروك**

**ئـەمینی مـیرزا کـەریم**

بووینه دراوسێی ماڵه فەلەستینییەك ، یەکـــــەم رۆژ کـــــە خانووەکەمان ئاوەدان کردەوە ، بەگەورەو بچووکیانەوە دەستیان بــــە پەرژینە کون ـ کوناوییەکەیانـــەوە گرتبــــوو ، گڵێنـــە پــــڕ پرسیارەکانیان لەگەڵ هەنگاوە قوورسەکانمانا بەرەو خانووی ژمــارە (٨) ئەگێڕا ، هەر ئافرەتە قژ خوورماییەکەیان مایەوەو جیا نەبۆوەو سەیـــری ئەکردین ، جۆرەها شت لە بیرما سەری کرد .. ( بەچیمان ئەزانـــن ؟! خۆکلك و شاخمان لێ نەڕواوە ؟ جگە لە زمان ئیتر هەموو شتێکمان وەك یەك وایە ، ڕەنگە دووراو دوور ناوی کوردیان بیستبێ ، ئەکەوینــــە هامۆشۆیان ... ) لێی چوومە پێشەوە ..

ـ گسکێکمان ئەوێ ..؟

ـ بەخێر بین ..

ڕۆیشتە ژوورەوە ، لە چاوە گەشەکانیا فرمێسك قەتیس مابوو .. ( بۆ گریاوە ؟ هیچ ئیشارەتێکمان پێوە نییە کەببێتە هۆی گریانی ... ) .

ـ فەرموو ..

ـ سوپاس ..

ـ پێویستییەکی تر ؟

ـ هەر بژین ...

لە سەر لێواری پەرژینەکەوە گسکەکەم لێ وەرگرت ، بە ئەلقەکەی پەنجەیدا بۆم دەرکەوت شووی کردووە ، بەرێگا تەنگە بەرەکەی نێوان هەردوو لامانا تێپەڕ بووم هەر لێم ورد ئەبۆوە ، کە هاتن بۆ لامان زانیم

مێردەکەی فیدائی بووەو شەهید کراوە ، بەخۆیو کۆشی منالەوە بە سەرباوکیا کەوتووە ، کزۆلە دانیشتبوو جارو بار ورتەیەکی لێوە ئەهات • هەر دایكو باوکی کەوتبوونە پرسیار ، ئەو چاوی لە ناو چاوما بوو ••• ( ـ ئاخۆ چەند هەزار لە بابەتی ئەم ئافرەتە هەبن••• )

ـ خانم بۆ قسە ناکەیت ؟

چاوەڕوانی ئەم پرسیارە نەبوو ، بەنیمچە شلەژانێکەوەو زەردە خەنەیەکی سەر لێو سەیری دایكو باوکی کردو ئەو پرسیارەی لێ کردمەوە کە یەکەم جار باوکی لێی کردین ••

ـ ئەلێم لە کوێوە هاتوون ؟

ـ لە ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانەوە ••

ـ ئەم ناوەم لەمێردەکەم بیستبوو ••

کات زمێرەکە دەجار لە سەریەك لێیدا هوشیاری کردن کە شەو درەنگ بوو •••

نۆرەی چوونەوەی هات •• هەر بێوە ژنەکە هەلئەسووڕا کە ئەگەیشتە لای من بۆ دواوە بەرز ئەی ڕوانیو سەیری ئەکردمەوە ، سەرنجی راکێشام ، ئاوڕم دایەوە وێنەیەك بە دیوارەکەدا هەلواسرابوو ، چاوم بڕی نە ئەکرد تەواو بیبینم ، بە چرپەش نەبوایە تێنەئەگەیشتن ، کە چی منالەکانم یەك بەدوای یەکا دەمیان ئەخستە بەنا گوێم ••

ـ وێنەی تۆیان هەلواسیوە •••

ئەم چرپانە ئەوانی گوێ قوولاغ کرد وا بۆی چوون کە شتیان ئەوێ ، مات بوومو کەوتمە بیرکردنەوە ••• « وێنەی من لێرە چی ئەکا ؟! یەکەم جارە ئێمە ئەوانو ئەوان ئێمە ئەبینن ، منالەکانم یەکێکیان درۆ ، دوانیان ؟! » باوکی بێوە ژنەکە خۆی پێ نەگیرا ••

- چیان ئەوێ ؟

- هیچ ••• هەروان •

منالەکان لە بەردەمی وێنەکەدا گرد بوونەوە ، هەستام کە بلاوەیان پێ بکەم‌و دایان نیشێنم ، کە نزیك بوومەوە سەیری وێنەکەم کرد •• ( منم •• من نیم •• منم •• من نیم ؟! باش بۆی چوون •• ) دەمی پرسیارم کردە هەموویان ••

- ئەم وێنەیە کێیە ؟

بێوە ژنەکە هاتە شانمەوەو بەدەنگێکی نزمی ناسك هەرئەوەندەی وت •

- مێردەکەمە •••

وردبوونەوەکەی‌و ئەسرینە پەنگ خواردووەکەی ناو چاوی ئەو رۆژە مێردەکەی هێناوەتە بیر کە کت‌و مت لە من ئەچوو ••••، دوو میلەکەی کات ژمێری ناو تەلەفزیۆنەکە لە سەر ژمارە دوانزە جووت بوون •

- دەنگ‌و باس ••

- وس بن ••

- ئەمرۆ دوو فیدائی فەلەستینی لە خاکی داگیر کراوا شەهید بوون •••

بێوە ژنەکە سەری نایەوە ، مانەوەی من لە لای ئەوەندەی تر دلگیری ئەکرد ، لە بەر ئەوە پەلەم کرد بۆ ئەوەی بەرەو خانووی ژمارە (٨) برۆینەوەو گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە تاکو دراوسێی یەك بین ئەو بێوە ژنە هەموو رۆژێ برینی ئەکولێتەوە •• دایکی منالەکانم لەتەکما ئەرۆیشت‌و لەبەر خۆیەوە ئەی وت ••

# کۆنگرەی پێنجەمی
# یەکێتیی نووسەرانی کورد

**سەرەتا :**

وەك هەموومان ئاگادارین ، پاش کۆنگرەی چوارەمـــی یەکێتی نووسەرانی کورد زۆری نەخایاند باری کوردســــتان ئاڵۆز بووەوەو بەوبۆنەیەوە زوربەی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەري هــــەڵبژێرراوی یەکێتیی‌یش لە جێی خۆیان نەمان ٠ بەوجۆرە مەڵبەندی گشتیی یەکیەتی لەکارکەوت‌و ، پاش ساڵێکیش کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبە دڵسۆزەکان کەوتنەوە کار بۆ گیان بەبەراکردنەوەی یەکیەتی ، هەرچەنـد میری‌یش لە سەرەتادا ڕێی‌دا کۆمەڵێك دابنرێ بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری یەکیەتی ، بەڵام بەهۆی کۆسپ‌و تەگەرەی هەندێ کەسی بـــۆ خـــۆ کارکردووی دوور لە پێویستی‌یەکانی ژیانی گەلی کـــوردو کولتووری کوردەوە ، نەتوانرا مەڵبەندی گشتی بژێنرێتەوە ، هەرچەند کە لقەکانی سلێمانی‌و هەولێر تارادەیەك هەڵسووڕانیان مابوو پەرەیان پێ‌ئەدا ٠٠

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٨دا کاربەدەستانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی وایان بەباش‌زانی‌و هاتنە سەر ئەو ڕایە کە ئەبێ یەکێتیی نووسەرانی کـــورد بژێنرێتەوەو گیانی بکرێتەوە بەبەرا ٠ هاتن بۆ ئەم مەبەستە دەستەیەکـــی ئامادەکاریان پێکەوە نا کە ئەندامانی یەکێتی بانگ‌کا بۆ کۆبوونەوە لـــە هەولێرو بۆ هەڵبژاردنی دەستەیەکی بەڕێوەبەر بۆ یەکێتی ٠

لەگەڵ ئەوەشدا کە بەپێی قانوونی کۆمەڵەکـــان ( قانون الجمعيات ) ئەبوو کۆبوونەوەکە لە بەغدا بوایەو ئەبوو ئەندامە ماوەکانی دەســـتەی بەڕێوەبەری هەڵبژێرداوی کۆنگرەی چوارەم بانگەکـــەیان بکردایەو ،

هەرچەندیش هەندێ لە ئەندامانی ئەم دەستەی ئامادەکارە ئەندامی یەکێتی نەبوون ، زوربەی زۆری ئەدیبە کوردەکان لەگەڵ سوپاسی کاربەدەستانی ئەمینداریتی گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌دا، بەدەم بانگەکەوە چوون‌و لە ڕۆژانی ١٠-١٤/٩/١٩٧٨ دا لە هەولێر کۆبوونەوەو لە دۆخ‌و بارێکی بەڕاستی دیموکراتیدا کۆنگرەی پێنجەمیان گرت‌و دەستەی بەڕێوەبەری نوێ‌یان هەڵبژاردو کۆمەڵێ بڕیارو ڕاسپێری‌یان دەرکردو چەند دەسکاری‌یەکی پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی‌یان کرد •

کۆبوونەوەکە لە بەیانیی ڕۆژی ١٠/٩دا دەستی پێ‌کرد لە هۆڵی ( ابن المستوفی )و میوانێکی زۆری بۆ هاتبوو • لەم کۆبوونەوەیەدا لەلایەن نوێنەری سەرکردایەتیی لقی باکووری پارتیی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب‌و وەزیری هاوئاوازی لەگەڵ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی مامۆستا خالید عەبد عوسمان‌و ئەمینداری گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی مامۆستا عەبدولغەففار صائیغ‌و نوێنەری دەستەی ئامادەکار کاك جەمال عەلی خدرەوە وتار خوێنرایەوە • هەروا سڵاوی پارتی‌یە نیشتمان پەروەرو پێشکەوتنخوازەکان‌و کۆمەڵەو ڕێکخراوە ئەدەبی‌و هونەری‌یەکان‌و چەند کەسێکی ڕۆشنبیری دیاری‌یش خوێنرایەوە • تەلگرافێکیش خوێنرایەوە کە دەستەی ئامادەکار ئامادەی کردبوو بۆ جەنابی سەرکۆمار تێکۆشەر أحمد حسن البکرو بۆ جێ‌نشینی سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش هاوڕێ صدام حسین • بەوجۆرە کۆبوونەوەی یەکەم دوایی هات •

لە کۆبوونەوەی دووهەمدا کە پاش نیوەڕۆ دەستی پێ‌کرد ، ئەندامانی کۆنگرە داوایان کرد کە تەماشای لیستەی ناوی ئەندامان بکرێ‌و ئەوانە

دیاری بکرێن کە مافی بەشداربوونی کۆنگرەیان هەیەو ، پاش جێبەجێکردنی ئەمە لەناو خۆیاندا دەستەیەکی بەڕێوەبەریان بۆ کۆنگرەکە هەڵبژارد بە سەرکردایەتیی مامۆستا عیززەدین فەیزیو ئەندامەتیی چەند برادەرێك • ئەنجا ئەندامەکان بوون بە چەند بەشەوەو هەر بەشێکیان دەستیان کرد بە کۆبوونەوە بەجیا بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری کۆنگرەو ئامادەکردنی ڕاسپێریو بڕیارو دەسکاری کردنەکانی پێڕەوی ناوخۆ •

لە ڕۆژی ١٣/٩دا ڕاسپێریو بڕیارو دەسکاری کردنەکانی پێڕەوی ناوخۆ خرانە بەردەستی ئەندامان بۆ دەنگ لەسەردانیان • لە پتر لە ١٢٠ ئەندامی بەشدار لە کۆنگرەدا تەنها ٨ کەسی مافی دەنگدان دارو ٢ کەسی بە بێ‌ماف دەنگدەر ڕایان وابوو مەڵبەندی یەکێتی بگوێزرێتەوە بۆ هەولێر کە ئەم مەسەلەیە گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکی زۆری لەبارەوە کرا • هەروەها کۆنگرە رای نەدا کە تەمەنی داواکەری ئەندامەتی لە ١٨ ساڵانەوە زیاد بکرێ • تێکڕایش ئەندامانی کۆنگرە داکۆکیان لە پێڕەوی ناوخۆ ئەکردو قایل نەبوون بخرێتە پشت گوێو هەنگاوی وا بنرێ کە پێچەوانەی پێڕەوی ناوخۆ بێ • ئەم بابەتە خولگەی هەموو لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرە بوو •

لە ڕۆژی ١٤/٩دا کە ڕۆژی هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەر بوو ، مامۆستایان عەبدولغەففار صائیغ ئەمینداری گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئوتۆنۆمیو کاك موحەممەد ئەمین موحەممەد ئەحمەد ئەمینداری گشتیی ناوخۆیش حازر بوون • هەروەها نوێنەرانی ئەو دەزگایانەش هاتبوون کە بەپێی قانوون پێویستە بێن •

مامۆستا ئەحمەد حامید قادر ئەندامی یەکێتیو ئەمینداری گواستنەوە

لیستەیەکی خوێندەوەو وتی ئەمە لیستەی هاودەنگیی هێزە نیشتمانپەروەرەکانەو داوای هەڵبژاردنی لیستەکەی کرد ، بەڵام زوربەی ئەندامانی کۆنگرە سوور بوون لەسەر ئەوە کە مافی ئەوەیان هەیە لە دەرەوەی لیستەکەش ئارەزوویان لە هەڵبژاردنی هەرکەس هەبێ ، هەڵی بژێرن . حاکمیش پشتی داواکەی گرتن و وتی داوایەکی قانوونی یە .

بەم چەشنە دەست کرا بە خوێندنەوەی ناوی ئەندامانی کۆنگرە کە مافی دەنگدانیان هەبوو ژمارەیان ١٣٢ کەس بوو . دەرکەوت ١٦١ کەسیان لەوێ بوون . جا لیژنەیەك هەڵبژێررا بۆ سەرپەرشتی کردنی دەنگدان و قاقەزی سپی بەسەر ئەندامەکانا دابەش کرا . پاش تەواوبوونی دەنگدان و دەنگ خوێندنەوە ، دەرکەوت ئەنجامی دەنگدان بەمجۆرە بووە .

(١) موحەممەدی مەلا کەریم ٨٩ دەنگ .

(٢) دوکتۆر عیززەددین موستەفا ڕەسوول ٨٦ دەنگ .

(٣) مامۆستا عیززەددین فەیضی عەبدوڵڵا ٦٧ دەنگ .

(٤) شێرکۆ فایق بێکەس ٦٦ دەنگ .

(٥) موحەممەد نووری جاسم بەدری ٦١ دەنگ .

(٦) لەتیف مەحموود بەرزنجەیی ( لەتیف هەڵمەت ) ٥٤ دەنگ .

(٧) مومتاز حەیدەر عاسم حەیدەری ٤٦ دەنگ .

(٨) ئەحمەد عەبدوڵڵا موستەفا ٤٢ دەنگ .

(٩) عەلی عەبدوڵڵا شەونم ٤١ دەنگ .

(١٠) ئەنوەر قادر موحەممەد ٤٠ دەنگ .

(١١) کەمال مەمەند میراودەلی ٤٠ دەنگ .

(١٢) ئەحمەد حامید قادر ٣٩ دەنگ .

(۱۳) کەریم موحەممەد سالّح زەند ۳۷ دەنگ •
(١٤) موستەفا سالّح کەریم ۳۷ دەنگ •

بەم جۆرە ۱۱ کەسی پێشوو بوون بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرو ۳ کەسی دوایی بوون بە ئەندامی تەنگانە •

ئێوارەی هەمان ڕۆژیش ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر کۆبوونەوەو کاریان بەمجۆرە لەناو خۆیاندا دابەش کرد :

(۱) دوکتۆر عیززەددین موستەفا ڕەسووڵ : سەرۆك •
(۲) مامۆستا عیززەددین فەیضی : جێ‌نشینی سەرۆك •
(۳) شێرکۆ بێکەس : سکرتێری کولتووری •
(٤) موحەممەدی مەلا کەریم : سکرتێری بەڕێوەبەریتی •
(٥) موحەممەد بەدری : ژمارەدار •

ئەندامەکانی‌تریش ئەندامی بێ‌ئەرك بن •

# دوابەیانی کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

لە دواڕۆژی کۆنگرەداو پێش هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری نوێی یەکێتی کاك موحەممەدی مەلا کەریم بڕیاردەری لیژنەی داڕشتنی بڕیارو ڕاسپێری‌یەکانی کۆنگرە ئەم دوا بەیانەی بەسەر ئەندامانی کۆنگرەدا خوێندەوەو بەیانەکە لەلایەن هەموانەوە پەسەند کرا :

پاش لە بەرچاو ون‌بوونێکی دوورو درێژ کە لەئەنجامی دۆخ و بارێکی سەختەوە ڕووی‌داو ، دوابەدوای هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆری

دڵسۆزانەی ئەندامانی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە بەغداو لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستاندا، بە یارمەتی یەکی پیاوانەی دەزگاکانی هەردوو دەسەڵاتی قانوون‌دانەرو قانوون جێبەجێکەری ناوچەی ئۆتۆنۆمی داری کوردستان‌و لەپێشی هەموویانەوە وەزیری دەوڵەت بۆ هاوئاوازی لەگەڵ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی مامۆستا خالید عەبد عوثمان‌و ئەمینداری گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی مامۆستا عەبدولغەففار سائیغ‌و ئەمینداری گشتیی ناوخۆ ئەمینداری گشتیی پێشووی کولتوورو لاوان مامۆستا موحەممەد ئەمین موحەممەد ئەحمەدو، بە چاودێریی سەرکردایەتیی سیاسیی حیزب‌و شۆڕش، لە ڕۆژانی ١٠-١٤/٩/١٩٧٨دا کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە هەولێر لەژێر دروشمی «با هەموو قەڵەمە پاکەکانی کورد یەک‌بگرن بۆ پشت گرتنی ڕەوتی شۆڕش‌و پتەوکردنی یەکێتیی نیشتمانی‌و ئۆتۆنۆمیی کوردستان»دا بەسترا. مامۆستا خالید عەبد عوثمان وەزیری دەوڵەت بۆ هاوئاوازی لەگەڵ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی کۆنگرەکەی بە وتارێك کردەوە. هەروەها نوێنەری سەرکردایەتیی لقی باکووری حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب‌و مامۆستا عەبدولغەففار سائیغی ئەمینداری گشتیی کولتوورو لاوانیش سەرو وتاریان خوێندەوە. هەروا گەلێ نامەو سلاویش خوێنرایەوە کە کۆڕو کۆمەڵە سیاسی‌یە نیشتمان پەروەرەکان‌و ڕێکخراوە کولتووری‌و هونەری‌یەکان‌و یەکێتیی‌یەکانی ئەدیبانی عێراق‌و تورکمان‌و چەند کەسی ناودارو ڕووی کولتووری‌و ئەدەبی‌و هونەری ناردبوویان بۆ کۆنگرە.

کاروباری کۆنگرە لە بارو دۆخێکی دیموکراسی‌داو بە دەمەتەقێی برایانەو بێ‌پێچ‌وپەناو ئاڵ‌وگۆڕکردنی بیروڕاوە بەسەربرا. لەئەنجامی ئەم گفتو گوو دەمەتەقێیانەدا چەند دەسکاری‌یەکی پێڕەوی ناوخۆی

یەکێتی کراو چەند بڕیارێك دراو چەند ڕاسپێری یەك کـرا کـە لەپاش لێکۆڵینەوەو دان پیانانیان لەلایەن ئەندامانی کۆنگرەوە هەموویان لەشێوەی دوایی یاندا بەسەر بەشدارانی کۆنگرەدا خوێنرانەوە •

لە دوادوایی کاری کۆنگرەداو بەر لە هەڵبژاردنی دەسـتەی بەڕێوەبەر ، کۆنگرە ئەم بڕیارانەی دا :

● کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد سڵاوی خـۆی ئەنێرێ بۆ سەرکردایەتیی سیاسیی حیزبو شـۆڕش بە سەرۆکایەتیی جەنابی سەرکۆمار تێکۆشەر احمـد حسـن البکرو هاوڕێ جێنشینی سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش جەنابی صـدام حسین ، بەرابەر بەو چاودێری یە بەخشندانەی چاودێریی دەزگا کولتووری یـە ڕەسمیی و میللی یەکانی کوردی بێ ئەکەن ، بەتایبەتی هیی یەکێتیـی نووسەرانی کورد • کۆنگرە هیوای وایە ئەم چاودێری یە بەخشندانەیـە چەند قات ببێتەوەو هەموو سەرێکی هەڵسووڕانی کولتووریی کـورد بگرێتەوە ، بەجۆرێ کە بتوانێ بێ هیچ جۆرە کەندو کۆسپێك خەریکی کاروباری خۆی بێ و ، ڕۆشنبیری کورد ببینێ کەوا باری کولتووری یە نەتەوەیی یەکەی زۆر باشەو لە سایەی شۆڕش و لە کۆشی دەزگاکانـی ئۆتۆنۆمی و لە چوارچێوەی دیموکراسیدا کە هـەموو مـەودایەکی داهێنان و هەڵسووڕانی داهێنەرانەی هەموو گەلی عێراق بە عـەرەب و کوردو کەمایەتی یەکانیەوە بگرێتەوە ، هەمیشە هەر گەشە ئەکاو بـەرەو پێشەوە ئەچێ • ئەدیبە کوردەکان هەمیشە هەر سـوور بوون و ئێستاش هەر سوورن لەسەر ئەوە کە دەسکەوتـە پێشکەوتـ خوازانەکانـی گەلەکەمان بپارێزن و لە ڕووی هەموو پیلانێکا بوەستن کە بە مەبەسـتی دەس بۆ بردنی ئەم دەسکەوتانە بێ •

● کۆنگرە سڵاوی خۆی ئەنێرێ بۆ هەموو ئەوانەی هەوڵو نەقەلای پیاوچاکانەی خۆیانیان دا بۆ ژیاندنەوەی مەڵبەندی گشتیی یەکێتیی نووسەرانی کوردو لقەکانی ، بەتایبەتی لەناو ئەمانەدا سڵاوی خۆی ئەنێرێ بۆ دەزگاکانی دەسەڵاتی قانوون‌دانەرو قانوون جێبەجێ‌کەری ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌داری کوردستان ، هەروا بۆ مامۆستا خالید عەبد عوثمان وەزیری دەوڵەت بۆ هاوئاوازی لەگەڵ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی‌و ، بۆ مامۆستا عەبدولغەففار صائیغ ئەمینداری گشتیی کولتوور لاوان‌و بۆ ئەمینداری گشتیی پێشووی کولتوورو لاوان ، ئەمینداری گشتیی ناوخۆ مامۆستا موحەممەد ئەمین موحەممەد ئەحمەدو بۆ هەموو کاربەدەستانی‌تر کە دەستێکی باشیان لەم مەسەلەیەدا بووە . کۆنگرە هیوای‌وایە ئەمانە لەمەوپاشیش هەروا پشتی یەکیەتی بگرن‌و یارمەتی‌یان پایەدار بێ بۆ سوودی ئۆتۆنۆمی‌و کولتووری کوردو ڕەوتی پێشکەوتخوازانەی تێکڕای وڵاتەکەمان .

● کۆنگرە سڵاوی خۆی ئەنێرێ بۆ ڕەوتی شۆڕشخوازانەی گەلی عێراق لەژێر سێبەری شۆڕشی ١٧ی تەمووزداو بۆ ئەو دەسکەوتە پێشکەوتخوازانەی وەدەست هێنراون‌و داوای گەشەپێدانی ئەم دەسکەوتانە ئەکات . هەروا داوای بەتین‌کردنی یەکێتیی نیشتمانی‌و پتەوکردنی ڕیزەکانی ئەو حیزب‌و هێزە پێشکەوتخوازانە ئەکا کە لەناو بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوەییی پێشکەوتخوازدا کۆبوونەتەوە ، لەپێناوی سوودی نیشتمان‌و بەختەوەریی گەلی عێراقدا بە عەرەب‌و کوردو کەمایەتی‌یەکانیەوە ، هەروا بۆ وەستان بەتوندی لەڕووی پیلانەکانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی‌دا کە ئەیانەوێ دەسکەوتەکانی گەلەکەمان‌و هەموو گەلانی عەرەب زەوت بکەن‌و لێیان بسەنن .

● کۆنگرە داوای بەتین‌کردنـــی ئۆتۆنۆمی‌و جێ‌گیرکردنـــی بنەماکانی‌و قووڵ‌کردنەوەی ناوەڕۆکی ئەکا بەجۆرێ کە ئەوەمان بـــۆ مسۆگەر بکا کە قانوونەکەی بەشێوەیەکی داهێنەرانەو زیندوو جێ‌بەجێ بکرێ‌و گەلی کـــورد بەتەواوی لەو مافـــە نەتەوەیی‌و بەڕێوەبەریتی‌و کولتووری‌یانەی بەهرەمەند بێ کە دانیان پیـــا نراوەو ، ناوچـــەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە هەموو ڕوویەکەوە بۆپێشەوە ببرێ •

● کۆنگرە پیرۆزبایی لەو هەڵمەتە نیشتمانی‌یـــــە سەرجەم‌گیرە ئەکا کە بو لەناوبردنی نـەخوێندەواری ئـــەبرێ‌و ، هەمـــوو ئەندامانی یەکێتی‌و ڕۆشنبیرانی‌تری کورد بانگ‌ئەکا بۆ بەشداربوون بـــە سەربەرزی‌یەوە لە هێنانەدیی ئەم ئەرکەدا کـــە ئەرکێکی شارستانەتی‌یانەی گەورەیە ئەگەر بێتو جێ‌بەجێ بکرێ ، قەڵەمبازێکی گەورە ئەبێ جۆری ژیانی گەلەکەمان ئەگۆڕێ‌و ڕێی بۆ خۆش‌ئـــەکا لـــە ژیانی ســـەدە ڕابوردووەکانەوە بگوێزێتەوە بۆ چەرخی زانست‌و ڕووناکی •

● کۆنگرە بەگەرم سلاو لە خەباتی بەهەقی گـــەلی عـــەرەبی فەلەستین ئەکا لەدژی ئەمپریالیزم‌و زایۆنیزم‌و پیلانەکانی کۆنەپەرستـــی کە ئەیانەوێ بەربەرەکانێی فەلەستین پاکـــۆ بکەن‌و ڕێگـــای خۆبەدەستەوەدانی بەسەردا بسەپێنن • کۆنگرە ناڕەزایی خـــۆی لـــەو ڕێبازە خیانەتکارانەیە دەرئەبڕێ کە سیستێمی میسر بـــە سەرکردایەتیی سادات‌و تاقمەکەی لەسەری ئەڕوا • هەروەها داوای بەتین‌کردنی ڕیزی هێزە پێشکەوتخوازەکانی عەرەب ئەکا بۆ یارمـەتی‌دانی گـــەلی فەلەستین بۆ سەندنەوەی وڵاتە داگیرکراوەکەی‌و بۆ دیـــاری کردنی چارەنووسی بەسەر خاکی وڵاتەکەی خۆیەوە •

● کۆنگرە بەتوندی ناڕەزایی خۆی لە پرۆژەکانی ئەمپریالیزمی ئەمەریکاو دەوڵەتە ئەمپریالیستی‌یەکانی‌تر دەرئەبڕێ کە ئەیانەوێ گیانی خۆ چەکدار کردن‌و بڵاوکردنەوەی چەکی سەرجەم‌کوژ بڵاوبکەنەوەو باری نێو دەوڵەتان ئاڵۆز بکەن‌و بەئاشکراو نهێنی دەست لە کاروباری ناوخۆی وڵاتە ئازادبووەکان وەرئەدەن بۆئەوەی سەربەخۆیی‌یان زەدە بکەن‌و دەسکەوتە نیشتمانی‌یەکانیان لێ بسەننەوە • کۆنگرە بەئاشکرا پشت‌گیریی خۆی دەرئەبڕێ بۆ گەلانی خەباتکەر لەپێناوی ئازادی‌و سەربەخۆییدا ، نەخوازەلا گەلانی ئەفەریقاو ئەمەریکای لاتینی ••

## ڕاسپێری‌یەکانی لیژنەی کولتووری

## کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

(١) گێڕانی میهرەجانێکی ساڵانە بۆ شیعر لە یەکێ لە پارێزگاکانی کوردستان •

(٢) گێڕانی کۆڕێك بۆ چیرۆکی کوردی کە سەرانسەری وڵات بگرێتەوە لە یەکێ لە پارێزگاکانی کوردستان •

(٣) بایەخ‌دان بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدیبە لاوەکان لە هەموو مەیدانێکدا •

(٤) داواکردن لە ڕۆژنامەکانی عێراق کە بایەخ بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی کورد بدەن بەشێوەیەکی بەدەرەتان‌و ڕێک‌پێك‌و ، لەم مەیدانەدا هاوکاری لەگەڵ یەکێتیی نووسەرانی کورد بکەن •

(٥) وەرگێڕانی دوو کۆمەڵە شیعرو چیرۆك لە باشترین بەرهەمی شیعرو چیرۆکی کوردی بۆ سەر عەرەبی هەموو ساڵێك ، لەلایەن لیژنەیەك پسپۆڕەوەو هەوڵدان بۆبلاوکردنەوەیان •

(٦) هەوڵدان بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی بۆ کاروباری کولتووری گشتی لەلایەن یەکێ لە دەزگا کولتووری‌یەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌یەوە •

(٧) داواکردن لە یەکێتیی نووسەرانی عێراق‌و دەزگا کولتووری‌یە عێراقی‌یەکانی‌تر کەوا یەکێتیی نووسەرانی کورد هاوبەش بکەن لە میهرەجانە ئەدەبی‌و کولتووری‌یەکانیاندا لە عێراق‌و لە دەرەوە •

(٨) داواکردن لە یەکێتیی نووسەرانی عێراق کەوا لە وەرزە کولتووری‌یەکانیدا چەند کۆڕێکیش بۆ ئەدەبی کورد تەرخان بکا •

(٩) هەوڵدان بۆ ئامادەکردنی فایلێکی تایبەتی بۆ بەرهەمی ئەدەبی کوردو ناردنی بۆ گۆڤاری ( لوتس ) کە یەکێتیی نووسەرانی ئاسیاو ئەفەریقا لە قاهیرە بلاوی ئەکاتەوە •

(١٠) هەوڵدان بۆ دامەزراندنی پێوەند لەگەڵ گۆڤارەکانی ( الاقلام وآفاق عربية والطليعة الادبية والاديب المعاصر ) بۆ بلاوکردنەوەی ئەدەبی کورد لەو گۆڤارانەدا •

(١١) تەرخانکردنی بەرنامەی هەفتەیی لە ئێسگەی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی بەغداو کەرکوك‌و مووسڵەوە کە یەکێتی‌و لقەکانی ئامادەی بکەن‌و پیشکەشی بکەن •

(١٢) هەوڵدان بۆئەوە کە پرۆگرامێکی تەواوی کوردۆلۆژی بخرێتە پرۆگرامی خوێندنی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغداو سولەیمانی‌یەوە •

(١٣) دامەزراندنی کتێبخانەیەکی گەورە بۆ مەڵبەندی یەکێتـــیو لقەکانی کە سەرچاوە پێویستەکانی ئەدەبی کـــوردی تیابێو هەمیشەیش دەوڵەمەندتر بکرێ •

(١٤) داوا لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا بکرێ کەوا لقێکی بەرزی کوردۆلۆژی خوێندن دابمەزرێنێ •

(١٥) هەوڵدان بۆ یەکخستنی نووسینی کوردی لە هەموو مـەودا ڕەسمی یەکاندا •

(١٦) چەسپاندنو بەرەوپێشبردنی خوێندنی کوردی لە هەمـــوو قۆناغەکانی خوێندندا لە هەمووڵایەکی کوردستانی عێراقداو وتنـــەوەی کوردی، لە هەموو قوتابخانەکانی عێراقدا •

(١٧) دەرکردنەوەی گۆڤاری ( ئەستێرە )ی منداڵانو دەرکردنــی ڕۆژنامەیەك بە کوردی بۆ منالان نە چەشنی ڕۆژنامەی ( المزمار ) •

(١٨) هەوڵدان لای ڕۆژنامەو گۆڤارەکان کەوا تەنها ئەو جـۆرە ڕەخنانە بلاوکەنەوە کـــە بیناکـــەرو مەوزووعینو کـــۆڕی ڕۆژنامەنووسی لە ڕەخنەی بڕووخێنو نازانستیو بەسووك تەماشاکردنی خەڵكو تانووت لێدانیان خاوێن کەنەوەو ، لەمڕووەوە هاوکاری لەگـەڵ یەکێتیی ئەدیبان بکەن •

(١٩) داواکردنی وتنەوەی دەرزی مێژووی کوردو کوردســـتان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا بە مەبەســـــتی بەتینکردنی برایەتیی کوردو عەرەبو چەسپاندنی لەیەكگەیشتنی تەواوی هەردوو گـــەلی عەرەبو کورد •

(٢٠) داوای دەستپێکردنەوەی دەرزوتنەوە بە کوردی لـــــە قوتابخانەکانی ناوچەی بادینان لە پارێزگای دهۆك •

(٢١) هەوڵدان بۆ ژیاندنەوەی کۆڕی زانیاری کوردو دانانــــی کادری کاریگەر بۆ ئەم کۆڕە کە مەرجەکانی کاری ئەکادیمیایی‌یانەیان تیابێ‌و زۆرکردنی بوودجەی کۆڕ بەجۆرێ کە بتوانێ ئـەرکی خۆی بـە باشی جێ‌بەجێ بکا •

(٢٢) هەوڵدان بۆ پێکەوەنانی ئەنیستیتوتێك بــۆ خــوێنــدنی زمانەوانی‌و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی •

# راسپێری‌یەکانی لیژنەی دانان‌و وەرگێڕان‌و بڵاوکردنەوەی کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

(١) پێکەوەنانی چەند لیژنەیەکی لێ‌هاتووی چالاك لە مەڵبەندی یەکێتی‌و لە لقەکانیدا بۆ دانان‌و وەرگێڕان‌و بڵاوکردنەوەو ، یارمەتی‌دانی ئەدیبە لاوەکان لەلایەن ئەم لیژنانەوە بــــۆ پاکژکردنی بەرهەمیـــان‌و ڕاستکردنەوەو پیاچوونەی لەبارەی زمانەوانی‌و ئەدەبی‌یەوە •

(٢) هەوڵدان لای دەزگا کولتووری‌یە ڕەسمی‌یەکان بۆ زۆرکردنی ئەو کتێبە ئەدەبی‌و کولتووری‌یە کوردی‌یانەی ئەو دەزگایانە لەســـەر حیسابی خۆیان لەچاپیان ئەدەن •

(٣) هەوڵدان لای دەزگا کولتووری‌یە ڕەسمی‌یەکان بۆ زۆر کردنی پارەی یارمەتی‌دانی چاپ کە بە دانەرو وەرگێڕەکانیان ئەدەن بۆ لەچاپدانی بەرهەمەکانیان بەجۆرێ کە هیـــچ نەبێ ٧٥٪ی ئـــەرکی لەچاپدانەکە بگرێتەوە •

(٤) دانانی خەلاتێکی ساڵانە بۆ باشترین بەرهەمی کوردی لە ساڵدا چ دانراو بێو چ وەرگێڕراو •

(٥) گیان بەبەراکردنەوەی گۆڤاری ( نووسەری کورد )و دانانی دەستەیەکی نووسەرانی چالاکو هەڵسووڕاو بۆی لەناو ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرو نووسەرە لێهاتووەکانی تردا بۆ سەرپەرشتی کردنو بەڕێوەبردنی •

(٦) دەرکردنی ژمارەی تایبەتیی ساڵانە لە گۆڤاری نووسەری کورد کە تەرخان بێ تەنها بۆ شیعر یا چیرۆك یا لێکۆڵینەوەی ئەدەبی یا زمانەوانی •

(٧) وەرگێڕانی هەڵبژاردەی بەرهەمی ئەدیبە کوردەکان بۆ سەر عەرەبی ساڵانە یا وەرزاو وەرزو ، بڵاوکردنەوەی لە شێوەی پاشبەندی گۆڤارەکەدا یا بە شێوەی کتێبی تایبەتی •

(٨) هەوڵدان لای دەزگا کولتووریو پەروەردەکارییە کوردییەکان بۆئەوەی ژمارەیەکی باش لە هەر بەرهەمێکی هەرکام لە ئەندامانی یەکێتی بکڕن •

(٩) دانانی هەموو ئەندامێکی یەکێتی بە ئابوونە لە گۆڤاری یەکێتیدا •

(١٠) تەرخان کردنی گۆشەیەك بۆ منالاَن لە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا کە لەژێر چاودێریی یەکێتیدا بنووسرێ •

(١١) هەوڵدان لای دەزگا کولتوورییە کوردییەکان بۆئەوەی پسپۆڕەکانیان کە کتێب هەڵئەسەنگێنن بۆئەوەی لەچاپیان بدەن یا یارمەتیی لەچاپدانیان بدەن ، لە ئەندامە لێهاتووەکانی یەکێتی هەڵبژێرن •

(١٢) داوا لە دەزگا کولتووری‌یە کوردی‌یەکان بکرێ کە چاپخانەی تایبەتی بۆ خۆیان پێکەوە بنێن بۆ چاپکردنی چاپەمەنی‌یەکانی خۆیان و هیی ئەندامانی یەکێتیی نووسەرانی کوردیش .

(١٣) دۆزینەوەی شێوەیەکی یەکگرتوو بۆ وەرگێرانی زاراوە زانستی‌یەکان بۆ سەر کوردی ، بەمەرجێ هەموو لا کولتووری‌یە ڕەسمی‌یەکان لەسەری بڕۆن .

(١٤) پێکەوەنانی لیژنەیەك بۆ بلاوکردنەوەی دیوانە بلاونەکراوەکان و لەچاپدانەوەی دیوانە بلاوکراوەکانی ئەدیبە کوردە کۆچ کردووەکان .

(١٥) هەوڵدان لای دەزگای کولتوورو بلاوکردنەوەی کوردی بۆ لەچاپدانەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یە نەماوەکان .

# ڕاسپێری‌یەکانی لیژنەی فۆلکلۆرو کەلەپووری میللیی کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

(١) کۆکردنەوەو نووسینەوەی تێکستی فۆلکلۆری لەسەر شریت و لەسەر کاغەز بە مەبەستی ڕێ‌خۆش‌کردن بۆ ڕاست‌کردنەوەو لێکۆڵینەوەو لەچاپدانیان ، لە سەرانسەری کوردستانی عێراقداو ، داوا کردن لە ئەندامانی یەکێتی کە لە ناوچەکانی کوردستان ئەژیەن و لە هەموو ڕۆشنبیرانی‌تر و لە مامۆستایانی کورد کە هەرکەس بەش بەحاڵی خۆی دەوری خۆی لەم مەیدانەدا ببینێ .

(٢) بلاوکردنەوەی هوشیاریی فۆلکلۆری و بایەخ‌دان بە فۆلکلۆرو قەدرزانینی لەناو هەموو کۆڕە کولتووری‌یەکاندا .

(٣) بەشوێندا گەڕانی ئەو بەرهەمانەی لە فۆلکلۆر ئەدوێن جا یا وەك کتێب بڵاوبکرێنەوە یا وەك وتار یا لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە ڕابگەیەنرێن •

(٤) بانگ کردنی سازمانە کولتووری یە ڕەسمی یەکان بۆئەوەی کە بایەخی زیاتر بە فۆلکلۆری کورد بدەن •

(٥) بڵاوکردنەوەی کاری تۆژەرەوە کوردەکان لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری ( نووسەری کورد ) •

(٦) داوا لە دەزگای لەچاپ‌دان‌و بڵاوکردنەوەی کولتووری کورد بکرێ کە گۆڤارێکی فۆلکلۆری بە کوردی دەربکا •

(٧) داوا لە دەزگای ڕادیۆو تەلەفزیۆن بکرێ کەوا بەرنامەی هەفتەیی دانێ بۆ فۆلکلۆر لەژێر چاودێریی یەکێتیی نووسەرانی کوردو لقەکانیدا •

(٨) داوا لە تیپە مۆسیقازەنەکان‌و مۆسیقارە کوردەکان‌و لە گۆرانی‌بێژە کوردەکان بکرێ کە دەس‌بەرداری لاسایی کردنەوەی مۆسیقاو گۆرانیی بێگانە بن‌و ئاوازەکانیان لە سەرچاوەی ڕوون‌و ڕەسەنی نەتەوەیی مۆسیقاو گۆرانیی کوردی هەلگۆزن بۆئەوەی هونەری کوردی بپارێزن لە فەوتان‌و چەشی کورد بە هەستی هونەریی نەتەوەیی پەروەردە بکەن ، لەگەڵ ئەوەشا بایەخ بە مۆسیقای جیهانی بدەن‌و هەوڵ‌بدەن بۆ بەرەوپێش‌بردنی مۆسیقای کوردی لەسەر بناغەی زانستی‌و هونەریی هاوچەرخ •

(٩) تێکستی فۆلکلۆریی کوردی وەرگێڕنە سەر زمانە بێگانەکان‌و ، تێکستە کوردی یە فۆلکلۆری یە بڵاو کراوەکان کە لە وڵاتەکانی ئەورووپادا

بڵاو کراونەتەوە یا وەرگێڕراونەتە سەر زمانە بێگانەکان سەرلەنوێ بە کوردی بڵاو بکرێنەوە •

(١٠) داوا لە ئەمینداریێتیی گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکرێ کە بەڕێوەبەریتی‌یەکی تایبەتی بۆ کەلەپووری فۆلکلۆریی کورد لە سلێمانی دابنرێ •

(١١) یارمەتی‌دانی ئەندامە فۆلکلۆری‌یەکانی یەکێتی بۆ لەچاپدانی بەرهەمەکانیان •

(١٢) دەسکاری نەکردنی دیالێکت بە هیچ‌جۆرێ لەکاتی نووسینەوەی هەر تێکستێکی فۆلکلۆریدا •

(١٣) پسپۆرە کوردەکان لە ئەندامانی یەکێتی‌و ئەوانی‌کە خەریکی لێکۆڵینەوەی تێکستە فۆلکلۆری‌یەکان بن‌و چاك‌و خراپیان لەیەك جوێ‌بکەنەوەو هەوڵ‌بدەن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو تێکستانەی بەهایەکی هونەری‌و ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتیی پێشکەوتوویان هەیە ، بە کتێب یا بە وتار یا بە باس •

(١٤) فرەکردنی ڕیکۆردی پێویست لە بارەگاکانی یەکێتیدا بۆ تۆمارکردنی هەر تێکستێکی فۆلکلۆری کە هەل بۆ تۆمارکردنی هەلکەوێ •

(١٥) داوا لە ئەمینداریێتیی گشتیی کولتوورو لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکرێ کە موزەخانەی فۆلکلۆری لە هەموو پارێزگاکانی کوردستانا دروست‌بکا •

(١٦) داوا بکرێ کە ئەنیستیتووتێکی فۆلکلۆری لە هەولێر بکرێتەوە •

## ڕاسپێری یەکانی لیژنەی کۆمەڵایەتیی
## کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

(١) بیناکردنی بارەگای تایبەتی بۆ یەکێتی‌و بۆ هەموو لقەکانی ، کە شایانی پایەو پلەی یەکێتی بێ‌و کۆڕو کۆمەڵ‌و کۆبوونەوەکان لەو بارەگایەدا بکرێن‌و بەشێکیشی بکرێ بە یانە بۆ ئەندامانی یەکێتی •

(٢) ڕێکخستنی گەشت بۆ ئەندامانی یەکێتی لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات بە کرێیەکی کەم وەك ئەندامانی نەقابەی مامۆستایان •

## ڕاسپێری یەکانی لیژنەی داکۆکی
## لە مافەکانی ئەندامانی
## کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

(١) ناردنی ئەندامی نەخۆش بۆ دەرەوەی عێراق بۆ تیمارکردن لەلایەن دەوڵەتەوە •

(٢) کەمکردنەوەی کرێی تیمارکردنی ئەندام‌و ماڵ‌و منداڵی لە نەخۆشخانە پلە یەکەکان‌و بەشە تایبەتی‌یەکانی نەخۆشخانە دەوڵەتی‌و ئەهلی‌یەکاندا •

(٣) پێوەندی پەیداکردن لەگەڵ لایەنە ڕەسمی‌یەکان بۆ دانانی قانوونێك بۆ خانەنشین کردنی ئەندامانی یەکێتی کە بەر قانوونەکانی‌تری خانەنشینی ناکەون ، لەگەڵ ژماردنی ماوەی بەئەدەبەوە خەریکبوونیدا بە خزمەت بۆ مەبەستی مانگانە زیادکردن‌و خانەنشین کردن ، ئەگەر ئەو

ناوەیە بەر کارێکی‌تر نەکەوتبێ کە خانەنشین مانگانـــەی خانەنشینیی لەسەر وەربگرێ • ئەندامە مردووەکانی یەکیەتیش بەر ئەم قانـــوونە بکەون‌و مانگانەی خانەنشینی بۆ ئەو میراتگرانەیان تەرخان بکرێ کـە بەپێی قانوون موستەحەقی مانگانەی خانەنشینین •

(٤) یارمـــەتی‌دانی ئەندامانی یـــەکێتی لە پەیداکردنی خانـووی شایاندا بۆیان •

(٥) داکۆکی‌کردن لە ئەنداماتی یەکێتی ئەگەر تووشی هـــەر ئازارو چەرمەسەرەیەك بوون بەهۆی شتێکی‌واوە کە پێوەندی بە ئازادیـی بیرو باوەڕەوە ببێ •

(٦) بەشدارکردنی ئەندامانی یەکێتی لـــەو کۆنگرەو میهرجان‌و کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبی‌یانەدا کـــە لـــە دەرەوەو ناوەوەی وڵات ئەبەسترێن •

(٧) تەرخان‌کردنی چەند زەمالەو ئیجازەی خوێندن هـەموو ساڵێ بۆ ئەندامانی یەکێتی لەوانەی مەرجە قانوونی‌یەکانیان تیا دێتـــەدی ، هەریەك بەپێی پسپۆڕیی خۆی •

(٨) دانانی پەیکەر بۆ ئەدیب‌و خاوەن‌بیرە کۆچ‌کردووەکانـــی کوردستان ، بەپێی مەرجە هونەری‌و زانستـــی‌یە نوێکان‌و ناولێنانـــی شەقام‌و مەیدان‌و قوتابخانەو دەزگـــا کولتووری‌یەکانی شارەکـــان‌و ناوچەکانی کوردەواری بە نـــاوی ئەوانەوە بـــۆ بەزیندوڕاگرتنی ناوو بیرەوەری‌یان •

(٩) داوا له لا پێوەندی دارەکان بکرێ کەوا چـــاو بەو بڕیارانەدا بگێڕنەوە کە لەم ساڵانەی دواییدا دەریان کردووە لەبارەی هەنـــــدێ چاپەمەنیی کوردیو پێوەنـــــدیدار بە کوردەوەو ، کتێبخانەکـــانو لا تایبەتییەکان ئاگادار بکەن لە ناوی ئەو کتێبو چاپەمەنییانەی کـــــە لیژنەیەکی تایبەتی قەدەغەییان لەسەر هەڵگرتن •

(١٠) کەمکردنەوەی کرێی هاتوچوو بە ئاسمانو ناو ئاوو بـــــە وشکانا بۆ ئەندامانی یەکێتی ، لە بڕگەی دەوڵەتیدا ، وەك چـــۆن بـۆ ڕۆژنامەنووسەکانو هونەرمەندەکان کراوە •

(١١) داوا لە دائیرەکانی حیساباتی دەوڵەت بکرێ پاداشی ئەندامانی یەکیەتی بەرابەر بە قسەکردنی سەر ڕادیۆو تەلەفزیۆنو نووسینی وتارو بڵاوکردنەوەی کتێبو شتیوا ، بە پۆستە یا بەهۆی بانقەوە بنێررێ بۆیان نەك داوا لە خۆیان بکرێ بێن وەریبگرن •

(١٢) ئەو ئەندامانەی یەکێتی کە بانگئەکرێن بۆ کۆنگرەیەك یـــا میهرەجانێك یا کۆڕێك یا دیدارێکی ئەدەبی یا کولتووری یا شـــتێکیوا یا ئەنێررێن بۆ بەشداربوون تیایدا ، بەر قانوونی موخەسسەسانی ئیفـــادو سەفەری دەوڵەتی بخرێن •

(١٣) شناسنامەی نوێ بۆ ئەندامانی یەکێتـــــی ئامادە بکـــرێو دابەشبکرێ بەسەریاندا •

# با ناوی ئەمانە لەیادنەکەین

یەکێتیی نووسەرانی کورد ، لەم چەند ساڵە کەمەی دامەزراندنو ژیانو کپبوونو ژیانەوەیدا بە هەموو یادگارو لاپــەڕە ڕەنگینەکانــی خۆیدا دەچێتەوە •

لە پاڵ هەموو شانازیو سەربەرزییەکدا چەنــد دڵوپ فرمێسکی وەفاداری لای پەیکەری گلکۆی ئەو ئەندامانەیدا دەڕێژێت کە چنگــی ڕەشی مەرگ لاشەی نازداریانی بە خــاك ســپارد ، بەڵام بەخشش و نووسینو یادگاریان بە نەمری لەناوماندا هێشتوونییەوە •

نەمردوون ، لەبەر ئەوە هەر ساڵی لە دایك بوونیان لای پەیکــەری نەمرییان دادەنێین •

« ئەندامانی کوچ کردوو و نەمری یەکێتیی نووسەرانی کورد » •

١ ــ شێخ ڕەووفی خانەقا ١٩٠٠ •

٢ ــ محەمەد ڕەمزی مەعرووف وەهبی ١٩٠٢ •

٣ ــ شێخ مەمدووحی بریفکی ١٩١٠ •

٤ ــ ڕەمزی محییەدین قەزاز ١٩١٠ •

٥ ــ دوکتۆر عەبدوڕەحمان نورجان ١٩١٢ •

٦ ــ مەمەتدی ڕەسوول ئاغا ( فانی ) ١٩١٣ •

٧ ــ عومەر ساقی حەسەن ١٩١٥ •

٨ ــ ڕەفیق تۆفیق چالاك ١٩٢٣ •

٩ ــ عومەر کەریم عەزیز ١٩٢٤ •

١٠ــ غەفوور ڕەشید داراغا ١٩٢٤ •

١١ــ محەمەد شەریف عوسمان ( مەلا شەریف ) ١٩٢٥ •

١٢ـ عەبدولسەمەد خانەقا ١٩٢٩ •

١٣ـ لەتیف شێخ حامید بەرزنجەیی ١٩٤٠ •

١٤ـ حسین محەمەد سەعید تاڵەبانی ١٩٤٦ •

ئەم ژمارەیە لە ژێرچاپدا بوو کە نووسەرانی کورد شینیان ئـــازە کردەووە ـ بۆ ـ •

١٥ـ أ • ب • هەوری •

هەر وەك پەیکەرێکی‌تر بـــــۆ یادی ئـــــەم نووسەرە نەمرانەش دادەتاشـــین •

ئیسماعیل حەقی شاوەیس •

گیوی موکریانی •

عەلی کەمال باپیر •

محەمەد تۆفیق ووردی •

ئەحمەد شالی •

× × ×

دوور •• تۆزێك دوورتر ، هەر لەم چەنـــد ساڵەی تەمەنــــــی یەکێتیدا ••• پەیکەری نەمری بۆ لاشەی نازدارو خامـەی ڕەنگینی •• ئەم نەمرانە هەڵکەندرا قەدری جان •

قەدریی جەمیل پاشای بورج •

ئەکرەمی جەمیل پاشای بورج •

رەشید کورد •

× × ×

عەرەبی شەمۆ •• دامەزرێنەری ئەدەبیاتی کوردی سۆڤیتی •

× × ×

دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان •

× × ×

# یەکێتیی نووسەرانی کورد
# ئەم بەرهەمانە بڵاوئەکاتەوە

یەکێتیی نووسەرانی کورد بڕیاریداوە کتێبی ( داغستانی من )ی ڕەسووڵ حەمزەتۆڤ کە ئەندامی یەکێتی عەزیز گەردی لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی ـ بڵاو بکاتەوە • هەر لە ئێستاوە دەستنووسی ئەم کتێبە دراوە بە چاپخانەو هیوامانوایە زۆری پێنەچێ بکەوێتە بەردەستی خوێندەواران •

× × ×

هەروا بڕیاری داوە کۆمەڵەی شیعرەکانی مامۆستا گۆران لە بەرگێکی نازدارو قەشەنگدا بڵاوبکاتەوە • بەهیوایێن هەر لە ماوەی ئەمساڵدا ئەم بەرهەمەش بکەوێتە بەردەستی دڵدارانی شیعری ناسکی گۆران •

× × ×

بابەتەکانی ژمارە دووی گۆڤاری نووسەری کوردیش خراونەتە ژێر چاپ • ئەم ژمارەیە لە هەموو ڕووەکانەوە تەواوییانە دوور ئەبێ کە ژمارە یەکی ئەم گۆڤارە تووشیان هات •

# پێرست



لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا
ژمارە ( ٢٤ )ی سالی ١٩٧٩ی دراوەتێ